# ڕێگاکەی بەردەم

## بیڵ گەیتس

The Road Ahead

by Bill Gates

لە پرۆژەکانی
تۆڕی تەکنەلۆژیای زانیاری کوردی

وەرگێرانی
سەردار عبداللە



www.kitn.net

## ناوەڕۆک

# پێشەکی وەرگێڕ

لەدوای تێکەڵبوونم لەگەڵ دونیای تەکنەلۆژیادا، هەردەم بیر لەوە دەکەمەوە ئایا کێن پێشەنگەکان لەو بوارەدا و چۆن ئەم جیهانەیان بە ئەمڕۆ گەیاند بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی. زۆرن ئەوانەی کە کاریان کردووە بۆ بەرەپێش بردنی تەکنەلۆژیا لە جیهاندا بەڵام ئەوەی هەندێکیان کردوویانە جیاوازە لەوانی تر نمونەی ئەم جیاوازیەش (بیڵ گەیتس)ی پیاوە خێرخواز و دامەزرێنەرەکەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە، کە لەماوەی ژیانیدا و هەتا ئێستاش بەردەوامە لە خزمەتەکەی بە بواری تەکنەلۆژیا. بیڵ گەیتس لەڕێگەی کارەکەیەوە بوو بە ملیۆنێر کە لەسەرەتادا وەکو خاوەن و بەڕێوەبەر لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت دەست بەکاربوو و توانی سەرکەوتنێکی باش بەدەست بهێنێت بە شێوەیەک هەرکەسێک کۆمپیوتەری کەسی بەکارهێنابێت ئەوا ویندۆزەکەی مایکرۆسۆفتی بەکارهێناوە.




ئەم کەسایەتیە لە شاری سیێاتڵ-واشینگتۆن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چاوی بە دونیا هەڵێناوە و لە ٢٨ی١١ی ١٩٥٥ لەدایکبووە. باوکی پارێزەرە بووە و دایکیشی مامۆستا. ئەو دووخوشکی هەیە یەکێکیان لەخۆی گەورەترە و ئەوی تریان لەخۆی بچووک ترە. گەیتس لە خوێندنگایەکی تایبەت

خوێندوویەتی و دوای تەواو کردنی بنەڕەتی و ئامادەیی بۆ خوێندن ڕوو لە زانکۆی هارڤردی ئەمریکی دەکات. بەڵام لە تەمەنی ١٩ساڵێدا ئەو وازی لە کۆلێژ هێنا بەهۆی ئەوەی ئەو لەگەڵ هاوڕێکەی پاوڵ ئەلێن بڕیاریاندا ئیش و خوێندن بەجێبهێڵن وکۆمپانیایەک دروست بکەن و بەڕێوەی ببەن.



ژیری گەیتس بۆ ئەو تێڕوانینە ڕوونەی لە جیهانی کۆمپیوتەری کەسی وایلێکرد ئەو سەرکەوتنە بەدەست بهێنێت لە کۆمپانیاکەدا، کە کۆمپانیاکەیان تەنها بە دوو کەس دەستی پێکرد کە بریتیبوون لەخۆی و هاوڕێکەی (پاوڵ). مایکرۆسۆفت بەخێرایی گەشەی کرد و لە ساڵی ١٩٧٩ ژمارەی فەرمانبەرەکانیان بوون بە ١٢ کەس و پاشان بڕیاریاندا کە کۆمپانیاکە لە ئەلبوکوێرکی بگوازنەوە بۆ سێیاتڵ. لە ماوەی یەک ساڵدا ژمارەی فەرمانبەرەکانیان بوو بە ٣٥ فەرمانبەر. لە دوایدا گەیتس و پاوڵ بڕیاریاندا بانگهێشتی بەڕێوەبەری پڕۆفیشناڵ (ستیف باڵمەر) بکەن بۆ گەشەدان بە مایکرۆسۆفت بۆ ئەم مەبەست و هاندانی باڵمەڕ ئەوان ٥%ی سەرمایەی مایکرۆسۆفتیان دا بە باڵمەر. لە ئێستادا مایکرۆسۆفت زیاتر لە ٢٠٠٠٠هەزار کرێکاری هەیە لە ٤٨ وڵاتدا.

لەدوای کارکردنێکی زۆر بەیەکەوە لە ساڵی ١٩٩٣ پاوڵ ئەڵێن بەهۆی نەخۆشییەوە کۆمپانیای بەجێ هێشت. بەڵام بیڵ بەردەوام بوو لە گەشەدان بە کۆمپانیا. دواتر لە هاوای لە مانگی ١ی ١٩٩٤ پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵ (مێلەندا) بەڕێوەبەری بەرهەمەکان لە مایکرۆسۆفت ئەنجامدا لەدوای ٢ ساڵی هاوسەرگیریان کچێکیان پەیدا بوو. بەڵێ بیڵ وەکو هەموو پیاوێکی دەوڵەمەند ساڵانە پارەیەکی زۆری دەست دەکەوت کە لە زۆرێک لە دەوڵەمەندەکانی ئەوکات زیارتبوو تادوایی وایلێهات بە دەوڵەمەندترین ناسرا. بێل یەکێکە لە زۆر خوێنەرەکان و بە خوێنەرە پەرۆشەکە ناسراوە و ئەمە جگە لەوەی زۆر خولیای یاری گوڵفە و ئەمانە و چەندین خولیای تر لە دەورووبەری ئەم پیاوە سەرسوڕهێنەر و داهێنەرە دەسوڕێنەوە...

وەرگێر: سەردار عبدالله

## کورتەیەک سەبارەت بە پەرتووکەکە:

پەرتووکی The Road Ahead لە ساڵی ١٩٩٥ چاپکراوە وپاشان دووبارە چاپێکی تازەی لێکرایەوە. ئەو کتێبە سەبارەت بە چەمکەکانی ژیان دەدوێت کە پەیوەستە بە ژیانی هەر یەکێکمان. بیل گەیتس ئەو کەسە بەناوبانەگەی توانی لە کاروباری کۆمپیوتەردا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بێنێت لەم پەرتوکەدا باس لە کۆمپیوتەری کەسی دەکات کە چۆن دووبارە دەبنە هۆی گۆڕینی ژیانی هەر تاکێکمان و هەروەها سەبارەت بەداهاتووی ئینتەرنێتیش دەدوێت کە چۆن گەشادەکات و بەردەوام بوونی گەشەکەشی. بیڵ لەم پەرتووکەیدا خوێنەران دەگەیێنێت بەو داهاتووە نزیکەی کە لەپەرتووکەکەیدا باسی کردووە – ئەو جیهانەی کە وەرەقە و کاغەز کەمترە تیایدا و مامۆستاکان شێری بیرۆکە و ئایدیاکانیان دەکەن و دەیگەیەنن بە زۆرترین ڕێژەی خوێندکار لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەو جیهانەی کە کۆمپانیاکان دەتوانن کۆنگرە ببەستن بە بێ بەجێ هێشتنی ئۆفیسەکانیان.....هتد.

هەرووەها لەم پەرتووکەدا بیڵ گەیتس تیشک دەخاتە سەر ئینتەرنێت کە چۆن جیهانی هەر یەکێکمان دەگۆڕێت و هەروەها بیڵ ئینتەرنێت ناودەبات بە "information highway" ئەمە لەکاتێکدایە بیڵ کوێرانە نەکەوتۆتە باسەکەی و بەڵکو باسی ئەو کێشانەش دەکات کە ڕووبەڕووی ئەو جیهانە و ئینتەرنێت دەبنەوە بەڵام پێداگیریش لەوە دەکات کە لەڕاستیدا کۆمپیوتەر هیچ نیە تەنها ئامێرێکی بەسوود لە ژیانی هەریەکەماندا.

**مەبەست لە وەرگێرانی پەرتووکێکی وەها بۆ سەرزمانی کوردی؟**

لەڕاستیدا و بیَ ئەوەی هیچ کەس لیَم زویر بێت وەرگێرانی پەرتووکە بیانیەکان لەبواری تەکنەلۆژیادا بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و ئەوانیتر نووسەرە کوردە بەڕێزەکان بەهەوڵ وهیممەتی خۆیان چەند پەرتووکێکیان نوسییوە، بەڵام ئەوەی من لیَی بێزارم نەبوونی پەرتووکی زۆرە لەو بوارەدا. بەڵیَ مەبەستمان لە وەرگێرانی پەرتووکێکی ئاوا هۆشیارکردنەوەی تاکی کوردە لە تێروانینی زانایان لەبوارەکاندا بۆ ئەوەی بزانین ئەوان چۆن بیریان کردووەتەوە لە سەرەتاکانی ژیانیاندا. (بیڵ)یش یەکیکە لەو زانا سەرکەوتوانە کە پێویستە چاو لە ڕێگە سەرکەوتوەکەی ژیانی بکرێت کە چۆن لە بواری تەکنەلۆژیادا توانی بەسەرکەوتوویی و بە کۆمەڵێک داهێنانەوە بگاتە ئەمڕۆ. لەوانەیە زۆریکمان بڵێین ئەم پەرتووکە زۆر کۆنە بەڵام ناوەڕۆکەکەی کۆن نییە و پێشبینی ئەم داهاتووەی ئێستای تێدایە کە بیڵ گەیس زیاتر لە ١٥ ساڵ لەمەوبەر پێشبینی کردووە و بگرە پێشبینی زیاتریش کە ئێستا ڕوویان نەداوە، کەواتە پرسیار: ئایا هیچ یەکێک لە ئێمە ڕۆژێک لە ڕۆژان بیری لە شتێک کردووەتەوە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی؟ لە راستیدا نەخێر – مەبەستم تاکی کووردە – یان ئەوەتا ڕاستر بڵێین تەنها لە بەروەو پێش بردنی کۆمەڵێک شتی بیَ سوود ئازایین و تەنها ئازایین کاتبەسەر بەرین لە شتێکی وەها کەسودی نییە تەنها کات بەسەربردن نەبێت!!.

## پێشەکی پەرتووکەکە

دۆکیۆمێنت چییە؟ زۆرینەی خەڵک دۆکیۆمێنت بەوە پێناسە دەکەن کە بریتیە لە پارچە کاغەزێک و شتێکت پێرادەگەێنیت. بۆ زیاتر لە ٥٠٠ ساڵ خەلکی کاغەزیان بەکارهێناوە بۆ هەڵگرتنی بیرۆکە و زانیارییەکان، نمونەش ئەم کتێبەی بەردەستان جۆرێکە لە دۆکیۆمێنت. لە ڕاستیدا دۆکیۆمێنت هەموو شتێکە کە تێیدا شتێک بە تۆ دەڵێت، هەروەها هەواڵی سەر تەلەفزیۆنیش بریتیە لە دۆکیۆمێنت. لەوانەیە لەداهاتوودا کاغەز بوونی هەر هەبێت بەڵام ڕێگەی تریش دەبن بۆ پاراستن و شێرکردنی بیرۆکەکان.

بیرۆکە و ڕێگە تازەکان لە ڕاپەڕاندنی کارەکاندا؛ کۆمپیوتەر لەپێشاندا ژیانمانی گۆڕی و ئێستاش جیهان دوبارە بەرەو گۆڕینە بەهۆی باشتر و خێراتری پەیوەندییەکان. دەبێت ژیانمان چی لێبێت لە ١٠ ساڵی تردا؟ دەبێت ئێمە چی بکەین و چی ببینین؟ ئەم پەرتووکە پڕییەتی لە پرسیار و وەڵام سەبارەت بە داهاتوو.

بیڵ گەیتس لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ هاوڕێکەی پاوڵ ئەڵێن دەست بە مایکرۆسۆفت دەکەن ئەمە لەکاتێکدا بیڵ تەنها ١٩ ساڵان دەبێت. مایکرۆسۆفت کۆمپانیاییەکی وەها گەورە نییە بەڵام داهاتیی لە زۆربەی کۆمپانیاکانی تری ناویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاترە. بیڵ گەیتس لە سێیاتڵ-واشنگتۆن لە دایک بووە، ئەو تا ئێستا لەگەڵ هاوسەرەکەی لە ناوچەیەکی نزیک سێیاتڵ ژیان بەسەردەبات.

لەم هاوڕێیانەشی کە کاریان لەگەڵ بیڵ کردووە لە مایکرۆسۆفتدا ببریتین لە ناسان میرڤۆڵد کە لە ١٩٨٦وە لە مایکرۆسۆفتە بەڵام پێش ئەوەی بێت بۆ مایکرۆسۆفت لە کامبریج ئیشی دەکرد. پاوڵ ڕێنێرسنی ڕۆژنامە نوس و پرۆگرام نوسیش کە لەساڵی ١٩٨٢ چیرۆکێکی گرنگی ڕۆژنامەیی لەسەر گەیتس و مایکرۆسۆفت نوسی.

## زاراوە بەکارهێنراوەکان

دیارە نوسەر هەندێک زارەوەی بەکارهێناوە تێگەیشتنیان گرانە، بۆیە بە شێوەیەکی جوان لەسەرەتای پەرتووکەکە ئەم زاراوانەی شیکردۆتەوە و کە دەتوانم بڵێم ئێستا ئێمە وەکو بەکارهێنەری کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت پێویستە لەسەرمان بە باشی بیانزانین. بۆ ئەم مەبەستە ئەمانەی خوارەوە چەند زاراوەیەکی بەکارهاتووی ناو پەرتووکەکەن کە لەکاتی خوێندنەوەی پەرتووکەکە بەرچاوت دەکەون:

- باینەری سیستەم (Binary System): ئەم سیستەمە سویچی "On" و "Off" بەکاردەهێنیت بۆ پێدانی ئەلف با بە کۆمپیوتەرەکە.

- بۆردی بولیتێن (Bulletin Board): لەڕێگەی ئەم بۆردەوە تۆ دەتوانی بیرۆکەکانت شێربکەیت لەگەڵ بەکارهێنەری کۆمپیوتەری تردا

بەناردنی پەیام لە کۆمپیوتەرەکەتەوە بۆ بۆردی بولیتن و هەروەها تۆ دەتوانیت پەیامی ئەوانیتریش بخوێنیتەوە کە خەڵکی تر ناردوویەتی. (تێبینی ئەمە مەبەستی ئەم مەکۆ و یانانەی ئێستایە کە خەڵکی تێیدا دەبێتە ئەندام ودەتوانن بیرۆکە و زانیارییەکان بگۆڕنەوە).

- تەلەڤیزیۆنی کەیبڵی (Cable Television): لەگەل ئەم جۆرەی تەلەفیزیۆندا ئەم وێنانەی کە تۆ دەیانبینیت لە ڕێگەی هەواوە نایەن بەڵکو ئەوان لە ڕێگەی هێڵێکی کارەباییەوە دێن.

- دیسکی پەستێنراو (Compact Disc): یەکەم دیسکی پەستێنراو تەنها مۆسیقای هەڵدەگرت، بەڵام ئێستا زانیارییەکان هەڵدەگرن کە دەتوانرێت بخرێتە کۆمپیوتەرەکەتەوە.

- شاشەی کۆمپیوتەر(Computer Screen): ئەم بەشەی کۆمپیوتەرە کە لە تەلەفیزیۆن دەچێت. تۆ دەبێت چاو لەم شاشەیە بکەیت لە کاتی ئیشکردن لەسەر کۆمپیوتەر.

- کۆنترۆڵ کۆنسۆڵ: کۆنترۆڵ کۆنسۆل مەکینەیەکی بچوکە و دەتوانێت ئامێرەکانی دەوری خۆی پێبکات و بکوژێنێتەوە.

- داتا (Data): واتا زانیاری و وشەیەکی ترە بەرامبەر بە وشەی information.

- نامەی ئەلیکترۆنی(E-mail): ئەو نامانەی کە لە کۆمپیوتەرەکانەوە گەشت دەکەن پێیان دەوتریت Email واتە نامەی ئەلکترۆنی.

- فیلتەر(Filter): فیلتەر شتێکە کە هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی زانیاری بۆ ئێمە.

هاکەر (Hacker): ئەم خەڵکانەن کە زانیاری زۆریان لە بواری کۆمپیوتەردا هەیە و هەروەها کۆمپیوتەریش بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی بچنە ناو کۆمپیوتەرەی کەسانی ترەوە.



- لاپتۆپ(laptop): ئەوە جۆرێکی کۆمپیوتەری بچوکە کە دەتوانیت لەگەڵ خۆت هەڵی بگریت.

- مایکرۆپرۆسێسەر چیپ (Microprocessor chip): بەشێکی کۆمپیوتەرە و بیردەکاتەوە.

- وشەی تێپەربوون(Password): وەکو کلیلێکی ئەلیکترۆنی وایە بۆ کردنەوەی قفڵێکی ئەلیکترۆنی. تەنها هەندێک کەس ئەم وشەی تێپەڕبوونە دەزانن و هەر ئەوانیشن دەتوانن بچنە ناو ئەو کۆمپیوتەرەی کە بەم وشەی تێپەڕبوونە قفڵکراوە.

- نەرمەکاڵا(Software): سۆفتوەیر ناوێکە بۆ کۆمەڵێک ڕێنمایی کە کۆمپیوتەر شوێنی دەکەوێت.(ماناى وایە بەرنامەکان بە فرمان پێکردن لەلایەن بەکاربەرەوە ئیش دەکەن و کۆمپیوتەرەکەش شوێن فرمانەکان دەکەوێت.)

- تێلیکۆمیوتینگ(telecommuting): ئەم شێوازەی پەیوەندی کردنە کەتۆ هەموو کارەکانت لەڕێگەی کۆمپیوتەرەوە بەڕێدەکەیت بۆ کۆمپیوتەرێکی تر.

- ڕاستی خەیاڵی (Virtual reality): کۆمپیوتەرەکان دەتوانن وێنەو ودەنگ بەکار بهێنن بۆ دروستکردنی شوێنێک. کە ئەم شوێنە خەیاڵیە بەڵام وەک ڕاستیش وایە ، وە شیاویشە کە وابیربکەیتەوە لەناویدایت.

# بەشی یەکەم

## بەشی یەکەمی ڕێگاکە

کاتێک سێزدە ساڵان بووم یەکەم پڕۆگرامم بۆ کۆمپیوتەر نووسی. پڕۆگرامێک شتێک بە کۆمپیوتەر ڕادەگەیەنێت بۆ کردنی شتێک. پڕۆگرامەکەی من بە کۆمپیوتەری ڕادەگەیاند کە گەمەیەک بکات. ئەم کۆمپیوتەرە زۆر گەورە وزۆر هیواش بوو، تەنانە شاشەیەکیشی نەبوو. بەڵام من وا هەستم کرد کە زۆر سەر سوڕهێنەرە. من تەنها منداڵێک بووم بەڵام کۆمپیوتەرەکە هەموو ئەو شتانەی کرد کە من پێم ڕاگەیاند بە کردنی. تەنانەت ئەمڕۆش هەر ئەوەیە کە سەبارەت بە کۆمپیوتەرەکان خۆشم دەوێت. کاتێک پڕۆگرامێک دەنوسم هەمیشە وهەموو کاتێک بە تەواوی کاردەکات.

کۆمپیوتەرەکە گەمەی ئێمە بوو، ئێمە لەگەڵ ئەو گەورە بووین و کاتێکیش ئێمە گەورە بووین لەگەڵ خۆمانماندا هێنا. ئێستا کۆمپیوتەر لە ماڵ وئۆفیسەکانماندایە. ژیمانی گۆڕی ودووبارەیش دەیگۆڕێتەوە لەبەرئەوەی ئێستا کۆمپیوتەرەکان دێنەوە یەک بۆ دروست کردنی سیستەمێکی نوێ. لەم سیستەمەدا، لەسەرتاسەری جیهاندا کۆمپیوتەرەکان دەست دەکەن بە کارکردن بەیەکەوە. کۆمپیوتەرکانمان دەبنە مۆبایل وئۆفیس وپەرتوکخانە وبانک بۆ ئێمە.

کاتێک ئێمە سەبارەت بەم سیستەمە نوێیە دەدوێین پێی دەڵێین (ئینتەرنێت). ئەم پەرتووکە هەوڵ دەدات بۆ وەڵام دانەوەی پرسیارەکان

سەبارەت بە داهاتووی ئینتەرنێت. بەوەی چۆن دەبێت وچۆن بەکاری دەهێنین. هەندێک کات کە سەبارەت بە داهاتووی ئینتەرنێت دەدوێین پیی دەڵیین (ڕێگا بەرزەکەی زانیاری).

کاتێک ڕێگا بەرزەکەی زانیاری دێت، دەبێتە هۆی هێنانی ڕێگەی نویَ بۆ کردنی شتەکان. ڕێگە نوێکان نامۆن وهەندێک کات خەڵکی سەبارەت بەم ڕێگە نوێیانە دەشڵەژێن ، بەڵام ئەم ڕێگایانە سەرەنج ڕاکێشن. من زۆر دڵخۆشم کە دەبمە بەشێک لەم کاتە نامۆیە.

من پێشتر هەستم بەم خۆشی وجۆش وخرۆشیە کردووە. لە دوای نوسینی ئەو یەکەم پڕۆگرامەم لە تەمەنی ١٣ ساڵی، هاوڕێکەم پاوڵ ئەڵێن و من کاتێکی زۆرمان بەسەر برد لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەکان، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپیوتەرەکان زۆر گران بوون. یەک کاتژمێر بەکارهێنانی یەک کۆمپیوتەر ٤٠ دۆلاری نرخ بوو، ئێمە لە هاوینەکاندا لەکاتی ئیشکردن بۆ کۆمپانیاکانی کۆمپیوتەر پارەمان پەیدا دەکرد.

پاوڵ ئەڵێنی هاوڕێم سەبارەت بە ئامێرەکان لە منی زیاتر دەزانی. من زیاتر ئارەزووم لە پڕۆگرام بوو. بەڵام من لەئەو فێربووم. ڕۆژێکیان لە ساڵی ١٩٧٢ کاتێک من ١٦ ساڵان بووم وئەو ١٩ سالان بوو، شتێکی نیشان دام کە دەیخوێندەوە. ئەو شتە سەبارەت بە کۆمپانیایەک بوو پێی دەوترێت ئینتێل و مایکرۆپرۆسێسەر چیپێکی تازەی هەبوو.

مایکرۆپرۆسێسەر چیپ بریتییە لە بەشێکی کۆمپیوتەر کە بیردەکاتەوە. ئەو مایکرۆپرۆسێسەر چیپە تازە زۆر زیرەک نەبوو، بەڵام ئێمە ویستمان ببینین ئەگەر بتوانین پرۆگرامی بۆ بنوسین. لە کۆتایدا پرۆگرامامان بۆ کرد بەڵام پارەیەکی باشمان دەست نەکەوت لەو پرۆگرامە.




*مایکرۆپرۆسێسەر چیپ*

لە بەهاری ساڵی ١٩٧٤ دووەم مایکرۆپرۆسێسەر چیپ لە ئینتێلەوە دەرکەوت. ئەوەیان زۆر زۆر زیرەکتربوو لەوەی پێشووتر. کاتێک دەربارەمان خوێندەوە بە پاولم وت کە ڕۆژی کۆمپیوتەرە گەورەکان کۆتای هات.

بەڵام ئەمە بیرۆکەیەکی تری نوێ بوو کە ئێمەی زیاتر سەرسام کرد. لە کانونی یەکەمی ئەم ساڵە، وێنەیەکی Altair 8800 مان بینی. Altair 8800 بریتی بوو لە مایکرۆکۆمپیوتەرێک لەگەڵ مایکرۆپڕۆسێسەر چیپە نوێکەی ئینتێڵ. کاتێک ئیمە ئەمەمان بینی. بیرمان کردەوە "نا نەخێر! خەڵکی هەڵدەستن بە نوسینی پڕۆگرامی دروست بۆ ئەم چیپە! من زۆر دڵنیا بووم لەمە و دەمویست ببمە بەشێک لەمە.

ئەوە ٥ هەفتە لە کاری قورسی ویست. بەڵام لەکۆتایدا ئێمە کردمان. ئێمە پڕۆگرامامان بۆ Altair 8800ـەکە هەبوو و شتی زیاتریشمان هەبوو. ئێمە یەکەم کۆمپانیامان لە جیهاندا هەبوو کە پڕۆگرامی بۆ مایکرۆکۆمپیوتەرەکان دەنوسی. لەو کاتەدا ناومان نا "مایکرۆسۆفت."

دەستپێکردنی کۆمپانیایەک ئاسان نییە. هەندێک کات مانای ئەوەیە کە تۆ ناتوانیت شتانێک بکەیت کە تۆ ئارەزووی کردنیان دەکەیت. کۆلێژم خۆش ویست. ئارەزووی هەبوونی دەمەتەقێ و گۆڕینەوەی بیروڕام لەگەڵ زۆر خەڵکی زیرەک هەبوو. بەڵام من زانیم کە دەبێت هەڵبژێرم. ئەو بەهارە پاوڵ بڕیاری دا کە پیشەکەی بەجێ بهێڵێت و منیش بڕیارم دا کۆلێژ بەجێ بهێڵم. لەو کاتەدا من ١٩ ساڵان بووم.

# بەشی دووەم
## سەرەتاکان

بۆ تێگەیشتن لە داهاتوو یارمەتی دەرە چاو لە ڕابردوو بکەیت. زیاتر لە ١٥٠ ساڵ لەمەوبەر، پیاوێکی بەریتانی بەناوی چارلس بابج بیرۆکەیەکی هەبوو سەبارەت بە ئامێرێک کە دەیتوانی لەگەڵ ژمارەکان کاربکات. ئەو ویستی ئامێرێک دروست بکات کە دەیتوانی شوێن فرمانی جیاواز بکەوێت بۆ کردنی کاری جیاواز. ئەمڕۆ، ئێمە بەم جۆرە ئامێرە دەڵێن کۆمپیوتەر و بە فرمانەکان دەڵێین نەرمەکاڵا "Software". نەرمەکاڵا بریتییە لە دەستەیەک فرمان کە تۆ دەتوانی بیدەیتە ئامێرێک بۆ ئەوەی پێی بڵێت چۆن شتێک بکات. بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بریتین لە نەرمە کاڵا "Software".

بۆ سەد ساڵی تر، خەڵکی کاریان لەسەر بیرۆکەکەی بابج کرد. لە کۆتایدا، لە ساڵانی١٩٤٠ـەکان، ئەوان یەکەم کۆمپیوتەریان دروستکرد. ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیای گەورە بەیەکەوە لەماوەی جەنگدا کاریان لەسەری کرد، کارەکەش نهێنی بوو. سێ لە کەسە بەناوبانگەکان کە یارمەتی دران لە دروستکردنی ئەو کۆمپیوتەرە بریتی بوون لە ئالان تیورینگ و کلاود شانۆن و جۆن ڤۆن نۆیمن.

تەنانەت پێش جەنگیش کلاود شانۆن ئارەزووی لە ئامێرە بیرکەرەوەکان دەکرد. ئەو نیشانی دا کە چۆن سویچە بچوکەکان دەبنە ئەلف بای کۆمپیوتەر. لە سیستەمەکەی ئەو دا کە سویچێک بریتی بوو لە OFF مانای "دروست"ی هەبوو و سویچێکی تر کە ON بوو و مانای "نادروست"ی هەبوو. ئەم سیستەمە سادەیە پێی دەوترێت "Binary System"، و کۆمپیوتەرەکان تا ئەمڕۆش بەکاری دەهێنن.

جۆن ڤۆن نۆیمن ئەمریکێکی لەدایکبووی هەنگاریا، شتێکی گرنگی زیادکرد. بیرۆکەیەکی هەبوو سەبارەت بەوەی چۆن کۆمپیوتەرەکان دەتوانن میمۆرییێک بەشێوەیەکی بەهێز بەکاربهێنن. دەست بەجێ کە ئەمە شیاووی بوون بوو کۆمپیوتەری مۆدێرن لەدایک بوو.

هەمیشە شیاو نییە بۆ کۆمپیوتەر زانیارییەکان بپارێزێت لە ناو میمۆرییەکەیدا بەبێ گۆڕینی ئەو میمۆرییە. زۆر جار کۆمپیوتەرەکە پێویستە زانیارییەکان بچوک بکاتەوە بۆ ئەوەی میمۆرییەکەی بتوانێت لەیەک کاتدا زانیاری زیاتر هەڵبگرێت. کۆمپیوتەر ئەمە زۆر ئەنجام دەدات پێش ئەوەی زانیارییەکانی بۆ کۆمپیوتەرێکی تر بگوازێتەوە.

هەر ساڵێک بێت ئێمە زانیار (data)ی زیاتر دەگوازیینەوە. Data وشەیەکی ترە بەرامبەر وشەی information. زۆربەی زۆری ئەو زانیاریانەی کە ئێمە ئەمرۆ بەڕێگەی جیاواز دەستمان دەکەوێت

لەڕێگەی کۆمپیوتەرەکانمانەوە دێت. و کۆمپیوتەرەکە دەینێرێت بۆ ئامێری جیاواز لەماڵەکەدا. بۆ نمونە ئەگەر کۆمپیوتەرەکە پەیامێکی دەنگی وەربگرێت ئەوا تەلەفۆنەکە زەنگ لێدەدات بەڵام بۆ نمونە ئەگەر پەیامەکە لەشێوەی وێنە یان وێنەکان یان فیلم بێت ئەوا کۆمپیوتەرەکە لەسەر تەلەڤیزیۆن نیشانیانی دەدات. بۆ نمونە نوسینی ڕۆژنامەیەک یان پەیامێکی فاکسی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکە دەردەکەوێت. هەروەها، لەوانەیە زانیاری تر هەبن. بەڵام ئێمە هێشتا ناتوانین بزانین چی دەبێت چونکە داهاتوو هەمیشە پڕییەتی لە سەرسوڕمانی.

هیچ سەرسوڕمانییەک لە ڕابردوو نییە، بەڵام وانە هەن. ئەو کۆمپانیایانەی کە پارەیان دەخەنە "ڕێگە بەرزەکەی زانیاری" هەوڵدەدەن کە هەمان ئەو هەڵەیە نەکەن کە کۆمپانیاکان لەماوەی ٢٠ ساڵی ڕابدوو کردیان. لە ڕابردوودا، ئەوان کاتێکی زۆریان لەسەر ئامێرەکە بەسەر برد و کاتێکی کەم لەسەر نەرمە کاڵا "Software". هەروەها کۆمپیوتەری وەهایان دروست نەکرد کە لەگەڵ نەرمەکاڵای کۆمپانیاکانی تر کاربکات.

کاتێک ئێمە دەستمان بە مایکرۆسۆفت کرد، ئێمە کارمان لەگەڵ MITS کرد ئەو کۆمپانیایەی کە Altair 8800 دروست کرد. لە ساڵی ١٩٧٧، کۆمپانیاکانی تریش –ئەپڵ و کۆمۆدۆر و ڕادیۆ شاک- کۆمپیوتەری بچوکیان دروست دەکرد و ئێمە نەرمەکاڵای خۆمانمان پێیان فرۆشت.

نەرمە کاڵاکەی ئێمە بەشێکی گرنگی ئەو کۆمپیوتەرانە بوو چونکە بەکاربەرانیش توانیان بەرنامەی بۆ بنوسن.

بەڵام بەکاربەران شتێکی تریان بە نەرمەکاڵاکەی ئێمە دەکرد، ئەوان دەیان برد! یەکێک کڕی و پاشان دای بەکۆمەڵێکی تر لە بەکاربەری کۆمپیوتەر بە کۆپی کردنی نەرمەکاڵاکە. بەداخەوە ئەم جۆرەی دزینی نەرمەکاڵایە تا ئێستا ون نەبووە.

تەنانەت بەم کێشەشەوە ئێمە نەرمەکاڵای زۆرمان دەفرۆشت. تەنها بە کۆمپانیا ئەمریکییەکان نا بەڵکو لە ساڵی ١٩٧٩ نیوەی زیاتری کارەکانمان لە ژاپۆنەوە دەهات.

لە ساڵێ ١٩٧٩، من و پاوڵ مایکرۆسۆفتمان گواستەوە بۆ شارۆچکەیەکی نزیک سیاتڵ، واشینگتۆن. کۆمپانیاکە گەشەی دەکرد. مایکرۆسۆفت زۆرباش کاری کرد چونکە ئێمە تەنها نەرمەکاڵامان دروستکرد و هەرگیزیش کۆمپیوتەرمان دروست نەکرد. کۆمپانیای کۆمپیوتەر دەهاتن بۆلای ئێمە بۆ نەرمەکاڵاکان. هەروەها لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆریان نەرمەکاڵاکانیان لە ئێمە دەکڕی، زمانی پڕۆگرام نوسینمان مایکرۆسۆفت بەیسک گرنگترین زمانی پڕۆگرام کردنی کۆمپیوتەر بوو.

کۆمپیوتەر و نەرمەکاڵاکانی جیاوازن لەو شتانەی کە تۆ دەیانکڕیت چونکە کۆمپیوتەر ونەرمەکاڵاکانی دەتوانن زیاتر بەسوودبن. ئەگەر تۆ کۆمپیوتەرێک بکڕیت چونکە تۆ دەتەوێت گەمەکانی کۆمپیوتەر بکەیت، کۆمپیوتەرەکە بەسوود تر دەبێت هەر کاتێک کە کۆمپانیا گەیمێکی نوێ دروست دەکات.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| $0_{hex}$ = $0_{dec}$ = $0_{oct}$ | 0 | 0 | 0 | 0 |
| $1_{hex}$ = $1_{dec}$ = $1_{oct}$ | 0 | 0 | 0 | 1 |
| $2_{hex}$ = $2_{dec}$ = $2_{oct}$ | 0 | 0 | 1 | 0 |
| $3_{hex}$ = $3_{dec}$ = $3_{oct}$ | 0 | 0 | 1 | 1 |
| $4_{hex}$ = $4_{dec}$ = $4_{oct}$ | 0 | 1 | 0 | 0 |
| $5_{hex}$ = $5_{dec}$ = $5_{oct}$ | 0 | 1 | 0 | 1 |
| $6_{hex}$ = $6_{dec}$ = $6_{oct}$ | 0 | 1 | 1 | 0 |
| $7_{hex}$ = $7_{dec}$ = $7_{oct}$ | 0 | 1 | 1 | 1 |
| $8_{hex}$ = $8_{dec}$ = $10_{oct}$ | 1 | 0 | 0 | 0 |
| $9_{hex}$ = $9_{dec}$ = $11_{oct}$ | 1 | 0 | 0 | 1 |
| $A_{hex}$ = $10_{dec}$ = $12_{oct}$ | 1 | 0 | 1 | 0 |
| $B_{hex}$ = $11_{dec}$ = $13_{oct}$ | 1 | 0 | 1 | 1 |
| $C_{hex}$ = $12_{dec}$ = $14_{oct}$ | 1 | 1 | 0 | 0 |
| $D_{hex}$ = $13_{dec}$ = $15_{oct}$ | 1 | 1 | 0 | 1 |
| $E_{hex}$ = $14_{dec}$ = $16_{oct}$ | 1 | 1 | 1 | 0 |
| $F_{hex}$ = $15_{dec}$ = $17_{oct}$ | 1 | 1 | 1 | 1 |

*باینەری سیستەم*

لەسەرەتادا، تەلەڤیزیۆن ئەوا گرنگ نەبوو لەژیانماندا وەکو ئەمڕۆ. یەکەم جار تەلەڤیزیۆنی زۆر نەبوون و بۆیە بەرنامەی تەلەڤیزیۆنیش کەم بوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەی کۆمپانیاکان تەلەفیزیۆنی زیاتریان فرۆشت، هۆی زیاتر هەبوون بۆ دروستکردنی بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و لەگەڵ بەرنامەی زیاتر خەڵکی زیاتر ویستیان تەلەفیزیۆن بکڕن.

هەمان شت بەسەر ئامێرە میوزیکە سیدییەکان داهات. کاتێک ئامێرە میوزیکە سیدییەکان یەکەم جار گەیشتنە کۆگاکان، تۆ نەتدەتوانی ئەو گۆرانی بێژ و گۆانییانە لەسەر سیدییەکان بدۆزییتەوە کە ئارەزووت دەکردن. بەڵام کاتێک خەڵکێکی زۆر دەستیان کرد بە کڕینی ئەم ئامێرانە ، کۆمپانیاکانی میوزیک پێویست بوو دەست بکەن بە دروستکردنی سیدی زیاتر. ئەمڕۆ، کاتێک کە دەتەوێت میوزیک بکڕیت ، عادەتەن سیدییێک دەکڕیت.

ئەم وانانە گرنگن بۆ کۆمپانیاکانی کۆمپیوتەر. کۆمپانیاکان پێویستە بیریان بێت کە خەڵکی لەکۆمپیوتەرەکانیان داوایە کە چەندین شتی جیاوازیان بۆبکات بەگوێرەی شیاوییەتی.

لە ساڵیٰ ١٩٨٠، دوو پیاو لە IBMەوە هاتن بۆ مایکرۆسۆفت بۆ ئەوەی سەبارەت بۆ کۆمپیوتەری کەسی گفتوگۆ بکەن، ئەو کۆمپیوتەرە بچوکانەی کە خەڵکی بتوانن لە ماڵەوە و لە کارە بچوکەکاندا بەکاری

بهێنن. IBM دەیویست ئەم کۆمپیوتەرە نوێیانە بە کەمتر لە ساڵێک ئامادەبن. هەروەها داوای لە ئێمەکرد کە نەرمەکاڵایان بۆ دروست بکەین.

بیرۆکەکەی IBM زۆر سەرنج ڕاکێش بوو. ئێمە ویستمان ببینە بەشێک لەمە. ئەم نەرمەکاڵاییەی کە ئێمە بۆ ئەوانمان دروستکرد پێیَ دەوترا MS-DOS. ئێمە نرخێکی زۆر کەممان دا پێیان بۆ ئەوەی بەکاری بهێنن، و کۆمپیوتەرکانییان بە نەرمەکاڵاکەی ئێمەوە زۆر بەباشی فرۆشران. دەست بەجێ خەڵکی دەستیان کرد بە نوسینی پرۆگرام کە لەسەر سیستەمی MS-DOS دروستکرابوون. ئەمە هەواڵێکی خۆش بوو بۆ ئێمە، چونکە لەم ڕێگەیەوە سیستەمەکەی ئێمە زۆر بەسوودتر بوو بۆ هەمووان. بۆ چەند ساڵێک، زیاتر لە نیوەی هەموو کۆمپیوتەرە کەسییەکان لە کاردا هی IBM بوون.

ئەم بازرگانییەی کە ئێمە لەگەڵ IBMمان کرد زۆر گرنگ بوو بۆ ئێمە، بەڵام لەساڵی ١٩٩٢ لە دوای چەند سەختییەک لەگەڵ جۆری نەرمەکاڵای جیاواز بۆ کۆمپیوتەرە نوێکان، ئێمە کارمان لەگەڵیان وەستاند.

هیچ شتێک کە تۆ دەیفرۆشیت تا سەر بە باشی کارناکات هەتاوەکو تۆ کاری لەسەر نەکەیت و باشتری نەکەیت. ئێمە MS-DOSمان باشتر و

باشتر کرد، بەڵام لە کۆتایدا ئێمە دروستکرنی MS-DOSمان وەستاند. لە جیاتی ئەمە، ئێمە نەرمەکاڵای مایکرۆسۆفت ویندۆزمان فرۆشت. ئێمە پلانمان وایە کە هەر دوو ساڵ یان سێ ساڵ جارێک سیستەمێکی نوێ ویندۆز دروست بکەین.

هەموویەکێک هەڵەدەکات لە ئێستا و لە داهاتووشدا. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە چی دەکەیت لە دوای ئەم هەڵانە. نهێنییەکەی سەرکەوتن لە بازرگانی ئێمەدا گۆڕانکارییە. من باوەڕم وایە کۆمپانیایەک دەتوانێت لەڕیزی سەرەوە بمێنێتەوە بە کردنی گۆڕانکاری دروست لەکاتی دروستدا.

## بەشی سێیەم
## شتانێک کە کۆمپیوتەرەکان دەتوانن بۆ ئێمەی بکەن

کاتێک من منداڵبووم، بەرنامەی (The Ed Sullivan)لەسەر تەلەڤیزیۆن کاتژمێر ٨ لەشەوانی یەکشەممان هەبوو. تۆ لەبەردەمی تەلەڤیزیۆن بووی لە کاتژمێر ٨ ئەگەر نا لەدەستت دەچوو بەڵام هیچ یەکێک نەیدەویست بەرنامەی (The Ed Sullivan)ی لەدەست بچێت.

ئێمە بڕیاردەدەین تەماشای چی دەکەین بەڵام کۆمپانیاکانی تەلەفیزیۆن بڕیار دەدەن کەی تەماشای دەکەن. بەم شێوەیە ٣٠ ساڵ لەمەوبەر

تەماشای بەرنامەی (The Ed Sullivan)م دەکرد. و ئەمەش ئەو شێوەیەیە کە زۆربەی زۆری ئێمە لەشەواندا تەماشای هەواڵ دەکەن.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠کان، VCR گەیشتە ماڵەکان. VCR ئامێرێکە کە فیلم و بەرنامەی تەلەفیزیۆنی لەبەردەگرێتەوە بۆئەوەی دواتر تۆ بتوانیت تەماشای بکەیتەوە یان بیانپارێزیت. ئێستا تۆ دەتوایت هەڵبژێریت چ کاتێک دەتەوێت تەماشای شتێک بکەیت.

گفتوگۆکردن لەسەر تەلەفۆنیش گۆڕا. پێش ئامێری وەڵامدەرەوەی تەلەفۆن ، تۆ دێیتەوە ماڵەوە لە دوای کار و نازانیت کەکەسێک ویستویەتی قسەت لەگەڵ بکات. ئێستا ئێمە دەتوانیبن گوێ لەپەیامەکانمان بگرین و ئەگەر ویستمان پەیوەندی بەو خەڵکانە بکەینەوە.

لە داهاتوودا، تەلەفیزیۆن بوونی دەبێت هەروەکو ئێستا هەیە بەڵام تەلەفیزیۆن لەڕێگەی کۆمپیوتەرکانیشەوە دەبێت. تۆ دەتوانیت لەهەر کاتێک بتەوێت تەماشای هەرشتێک بکەیتەوە کە پێشتر لەسەر تەلەفیزیۆن بووە.

ئیمەیڵەکەشت بەم شێوەیە دەبێت و کۆمپیوتەرەکەت بۆت پاشەکەوت دەکات هەتاوەکو تۆ ئامادەدەبیت بیخوێنیتەوە. بەڵام (ڕێگە بەرزەکەی زانیاری) تەنها نابێتە تەلەفزیۆنێک و پۆستێکی ئەلیکترۆنی بەڵکو

زیاترمان دەداتێ. یارمەتیمان دەدات فێرببین و بازاڕبکەین و بەدوای پارەدا بگەڕێین و گفتوگۆ لەگەڵ خێزانەکانمان و هاوڕێیانماندا بکەین. ئەمە کێشەنابێت ئەوان لە چ جێگایەکی ئەم جیهانەن.

شاشەکانی کۆمپیوتەر باشتردەبن وەک ئەوەی ئێستا هەن. وێنەکانیان ڕوونتر دەبن و دەتوانین هەندێکیان بەکاربهێنین کە لەسەریان بنوسین و وێنەبکێشین. ئەوانی تر بەیەکەوە کاردەکەن بە تەلەفۆن. و دەموچاوی ئەم کەسانەمان نیشان دەدات کە پەیوەندیمان پێوەدەکەن.

لە جیهانی ئەمڕۆدا خەڵکی پێویستیانە لە کاتی گەشتیشدا کاربکەن. بۆ چەندین ساڵ ئێمە لاپتۆپمان هەبووە. لاپتۆپ کۆمپیوتەرێکی بچوکە و تۆ دەتوانیت لەگەڵ خۆتی هەڵبگریت بەڵام ئێستا کۆمپیوتەر هەن لە گیرفانەکاندا دەڕۆن.

ئەم کۆمپیوتەرە گیرفانیانە زانیاری هەڵدەگرن و هەروەها ئەوان پەیامەکان دەنێرن یان دەتوانن گەمە کۆمپیوتەرییەکان بکەن. لە چەند ساڵی تر تۆ ناتەوێت پارە لە گیرفانەکانتدا هەڵبگریت چونکە تۆ کۆمپیوتەرە گیرفانییەکەت بەکاردێنیت بۆ کڕینی شتەکان. ئەو دەبێتە بانکە بچوکەکەی تۆ و هەر تۆ دەتوانیت بەکاری بهێنیت.

یەکێک لە کێشەکان کە خەڵکی بیری لێدەکەنەوە سەبارەت بەداهاتووی ئینتەرنێت "زانیاری کەڵکەبوویە". ئەوان وا بیردەکەنەوە کە ئینتەرنێت

دەبێتە چیایەک لە زانیاری و ئەو چیایەش بەسەریاندا دەڕوخێت. بەڵام ؛ زانیاری زۆر زۆر کێشەیەکی نویێ نییە و کێشەیکیش نییە کە ئێمە تەنها لەگەڵ کۆمپیوتەرەکان هەمان بێت. بۆ خولەکێک بیر لە پەرتووکەکان بکەرەوە. کاتێک بۆ پەرتووکخانەیەک دەڕۆیت. ئایا تۆ دەشڵەژییت سەبارەت بە خوێندنەوەی هەموو پەرتووکەکان؟ نە خێر بە دڵنیاییەوە نەخێر. تۆ دەزانی ئارەزووی چی دەکەیت. تۆ دەزانیت دەتەوێت چی بخوێنیتەوە و سیستەمی پەرتوکخانەش یارمەیتیت دەدات لە دۆزینەوەی.



*کۆمپیوتەرێکی گیرفانی*

ئینەتەرنێت فیلتەری هەیە. فیلتەر یارمەتیت دەدات ئەو زانیارییە هەڵبژێریت کە تۆ دەتەوێت. فیلتەرەکانی سبەی باشتر دەبن لە هی ئەمڕۆ.

ئەگەر تۆ ئارەزووی تۆپی پێ دەکەیت، کاتێک تۆ پرسیار سەبارەت بە وەرزش دەکەیت کۆمپیوتەرکەت براوەکانی یاری تۆپی پێت نیشان دەدات. بە دڵنیاییەوە، تۆ پێویستە گەلێک شتی پێ بڵێیت چونکە فیلتەرەکە باشتر کاردەکات گەر سەبارەت بە تۆ زیاتر بزانێت.

کۆمپیوتەرەکانی ئەمڕۆ وەکو یەکەم ڕۆژی کرێکارەکان وان. تۆ پێویستە فرمانەکان بەوریاییەوە سەبارەت بەهەموشتێک بدەیت. و ئەم کۆمپیوتەرانە هەمیشە دەبنە کرێکارە یەکەم ڕۆژییەکان و هەرگیز لەتۆوە فێرنابن.

فیلتەرێک کە زۆر سەبارەت بە تۆ دەزانێت دەتوانێت لە تۆوە فێربێت. ئەو فیلتەرە لەبیریدا دەبێت کە تۆ لە چیدا باشیت. هەروەها لەبیری دەبێت تۆ ئارەزووی چی دەکەیت و ئارەزووی چی ناکەیت. هەروەها یارمەتیت دەدات لە ڕێگەی ترەوە.

لەبەرئەوەی فیلتەرەکان فێردەبن هەروەها دەگۆڕێن. کاتێک فیلتەرێک زۆر زیرەک دەبێت. پێی دەڵیین "بریکار" تەنانەت ئەم فیلتەرە دەنگیشی دەبێت.

هەندێک خەڵک ئارەزووی ئەم بیرۆکەیە ناکەن سەبارە بە گفتوگۆ لەگەڵ کۆمپیوتەردا. ئەوان دەڵێن "ئەمە زۆر نامۆیە."بەڵام ئێمە پێشتر لەگەڵ ئامێرەکان دواوین. کاتێک ئۆتۆمۆبیلەکەت یان کۆمپیوتەرەکەت کارناکات

تۆ بەسەریدا هاواردەکەیت. ئێمە زۆربەی کات بەسەر شتەکاندا هاواردەکەین. ئێستا لەجیاتی هاوارکردن، ئێمە دەتوانین قسەبکەین. بەڵام زۆربەی زۆری ئەوە بۆ چەندین ساڵی تر ڕوو نادات.

دروستکردنی ئینتەرنێتی داهاتوو _ ڕێگە بەرزەکەی زانیاری _ دەبێتە کارێکی گەورە. سیستەمەکە پێویست دەکات لەگەڵ چەندین جۆری کۆمپیوتەر و ئامێری تری هەڵگری زانیاری کاربکات. لەوانەیە زۆر گران بێت دروستکردنی بەڵام دروستبوونی پێشتر دەستی پێ کردووە. ئینتەرنێت دەستەیەک کۆمپیوتەرە کە زانیاری Share دەکەن. ئینتەرنێت پێشان لێرەبووە و  گرنگترین بیرۆکەیە لە بازرگانی کۆمپیوتەر لەوەتەی کۆمپیوتەرە کەسییەکانەوە.

ئینتەرنێت سیستەمی تەلەفۆنەکان بەکاردەهێنێت. کاتێک پەیامێکت بۆ دەنێرم، لە کۆمپیوتەرەکەی من دەچێت بۆ تەلەفۆن و پاشان لەوێوە بۆ کۆمپانیای ئینتەرنێتەکەم پاشان کۆمپانیاکەم دەینێرێت بۆ تۆ.

ئینتەرنێت سیستەمێکی سەرەنج ڕاکێشە بەڵام هەندێک کێشەی هەیە کە یەکێک لە ترسناکترینی کێشەکان هاکەرەکانن، ئەو خەڵکانەی کە زۆر سەبارەت بە کۆمپیوتەرەکان دەزانن و ئەمە بەکاردەهێنن بۆ چونە ناو سیستەمی کۆمپیوتەری خەڵکی ترەوە. لە ٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٨ هەزاران ئەو کۆمپیوتەرانەی ئینتەرنێتیان بەکاردەهێنا دەستیان بە

هێواشبوونەوە کرد. هەندێکیان ڕاوەستان لەکار. کۆمپانیاکان بە کاتژمێر کار و پارەیان لەدەست چوو. هۆی کێشەکە بەرنامەیەک بوو کە هاکەرێک پێش چەند مانگێک خستبویە ناو سیستەمەکە.

بەڵام زۆربەی کات، ئینتەرنێت بە باشی ئیش دەکات. ئەمڕۆ، بە ملیۆنان خەڵک بەکاری دەهێنن و زۆر دڵخۆشن بە بەکارهێنانی.




*تەلەفیزیۆنی کەیبڵی*

گۆڕانێکی تر بۆ ئینتەرنێت دەگات. دەست بەجێ تۆ فیلمەکان لەسەر تەلەفیزیۆنەکەت دەبینیت یان لەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەت لەبەر

ئەوەی تۆ هەڵتبژاردن. ئەم فیلمانە لەڕێگەی تەلەفیزیۆنی کەیبڵیەوە دێن. تەلەفیزۆنە کەیبڵییەکان و کۆمپانیاکانی تەلەفۆن دەجەنگێن بۆ دەستخستنی تۆ وەکو کڕیارێک بۆ ئەو شتانەی ئەوان پێشکەشی دەکەن: فیلم، بانککردن، بازاڕکردن....هتد.

کۆمپیوتەری کەسی یارمەتی خەڵیک دا لە کۆمەڵێک ڕێگەوە. ئینتەرنێت زیاتر دەکات؛ ئەو دەرگا بەڕووی زۆربەی زانیاری جیهاندا دەکاتەوە.

# بەشی چوارەم

## گۆڕانکارییەکان لە سیستەمەکانی زانیاری

دۆکیۆمێنت چییە؟ زۆرینەی خەڵک دۆکیۆمێنت بەوە پێناسە دەکەن کە بریتیە لە پارچە کاغەزێک و شتێکت پێرادەگەیێنیت. بۆ زیاتر لە ٥٠٠ ساڵ خەلکی کاغەزیان بەکارهێناوە بۆ هەڵگرتنی بیرۆکە و زانیارییەکان، نمونەش ئەم پەرتووکەی بەردەستان جۆرێکە لە دۆکیۆمێنت.

لە ڕاستیدا دۆکیۆمێنت هەموو شتێکە کە تێیدا شتێک بە تۆ دەڵێت، هەروەها هەواڵی سەر تەلەفزیۆنیش بریتیە لە دۆکیۆمێنت. لەوانەیە لەداهاتوودا کاغەز بوونی هەر هەبێت بەڵام ڕێگەی تریش دەبن بۆ پاراستن و شێرکردنی بیرۆکەکان.

ئێنتەرنێت ڕێگەی بە ملیۆنان خەڵک داوە بزانن کە دۆکیومێنتە ئەلیکترۆنییەکان لە کۆمپیوتەرەوە دەگوازرێتەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر. لەبەرئەوەی کۆمپیوتەرەکان دەتوانن زیاتر بکەن لەوەی کاغەزەکان دەیکەن، ئەم دۆکیومێنتانە زیاتر بەسوود دەبن بۆ تۆ. بیرۆکەی "دۆکیومێنت " لە داهاتوودا دەگۆڕێت.

کاتێک من گەنج بووم، ئەو زانیاری نامەیەم خۆشدەویست کە خێزانەکەم هەیانبوو. کاتێک ویستبام سەبارەت بە شتێک فێرببم، من

دەمتوانی دەربارەی بخوێنمەوە و تەماشای وێنەکانی بکەم. من کاتێکی زۆرم بەسەر برد لەگەڵ زانیاری نامەکە و زۆریم لێ خوێندەوە.

مایکرۆسۆفت ئینکارتا زانیاری نامەیەکە، ملیۆنێک وشەی تێداهەیە و هەروەها وێنەی فۆتۆگرافی و فیلم و میوزیکیشی تێدایە. ئەگەر تۆ ویستت سەبارەت بە میوزیکی میسری بزانیت، تۆ دەتتوانیت نمونەی میوزیکەکە ببیستیت لەکاتی خوێندنەوە دەربارەی ئەو شتە. هەروەها تۆ دەتوانیت گوێبیستی کەسە بەناوبانگەکان بیت چییان وتووە یان تەماشای فیلمێک بکەیت کە چۆن ئامێرێک کاردەکات. هیچ زانیاری نامەیەکی کاغەزی ناتوانێت ئەمانەت پێ بدات.

دۆکیۆمێنتە کاغەزییەکان تەنها نیین کە دەگۆڕێن. هەواڵی تەلەفیزیۆنیش ئەوەندە درێژدەبێت کە دەتەوێت. ئەگەر تۆ زانیاری زیاترت ویست لەسەر شتێک کە ئەوان گفتوگۆی لەسەر دەکەن، تۆ بۆت هەیە پرسیار دەربارەی بکەیت.

لە پێشاندا تۆ دەتتوانی زانیاری لەسەر ئینتەرنێت شێربکەیت. بە دانانی پەیام و وشەکانت لەسەر بۆردی بولێتن تۆ دەتوانیت بیرۆکەکانیش شێربکەیت. بولێتن بۆردی ئەلیکترۆنی بریتییە لە شوێنێک لە سیستەمێکی کۆمپیوتەردا کە خەڵکی دەتوانن پەیام بنوسن و بخوێننەوە سەبارەت بە شتێک کە ئارەزووی دەکەن. ملیۆنێک خەڵک دەتوانن

ئەوەی نوسیوتە بیخوێننەوە، یان هیچ یەکێک نایخوێنێتەوە. بە هەر ڕێگەیەک بێت تۆ بیرۆکەکەی خۆت دەخەیتە ئەو شوێنەوە. هەروەها بولێتن بۆرد سەبارەت بە زۆربەی زۆری شتەکان هەیە لەسەر ئینتەرنێت.

گەمەکان شتانێکی ترن کە خەڵکی ئارەزووی دەکەن سەبارەت بە کۆمپیوتەرەکان. ئەمڕۆ، زۆربەی گەمە کۆمپیوتەرییەکان لەسەر سیدی تایبەتین. هەر یاری کەرێک هەمان گەمە دەست پێدەکات بەڵام ئەوەی گەیمەکە دەگۆڕێت ئەوەیە کە ئەو چی هەڵدەبژێریت بەوەی کە بە گەمەکەی ئەنجام دەدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئینتەرنێت گەشە دەکات، خەڵکی دەست دەکەن بە یاریکردن لە دژی بەکاربەری کۆمپیوتەری تر نەک بەتەنها خۆیان.

کۆمپیوتەرەکان فیلمەکانیشیان گۆڕی. نەرمە کالای کۆمپیوتەر بوو کە گیانەوەرانی ناو Jurrasic parkی بەخشی بە ئێمە و هەروەها زۆربەی زۆری بەشە هەبووەکانی تر لە فیلمەکانی تری وەکو The Lion King و The Mask.

یەکێک لە سەرەنج ڕاکێشترین بیرۆکەکان سەبارەت بە جیهانی کۆمپیوتەرەکان Virtual Realityییە. Virtual Reality یان VR بریتییە لە سیستەمێکی وێنە و دەنگەکان کە کۆمپیوتەر بەکاری دەهێنێت

بۆ دروست کردنی شوێنێک "a place" شوێنەکە شوێنێکی ڕاستی نییە. بەڵام بە ڕاستی دەچێت، وا هەست دەکەیت لەناوی دایت. دەتوانیت چاو لە ڕاست و چەپت بکەیت و سیستەمەکە دەزانێت کە تۆ سەرت دەسوڕێنیت و ئەویش وێنەکان دەگۆڕێت. تۆ ئەم شوێنانە دەبینیت لە شوشەی کۆمپیوتەری تایبەتییەوە. لەگەڵ VR، تۆ توانای ئەوەت دەبێت فێربیت کە چۆن فڕۆکەیەک بفڕێنیت یان ئۆتۆمۆبیلێک لێ بخوڕیت یان بچیتە ناو لاشەوە ببینیت کە چۆن دڵ کاردەکات ئەمە هەمووی بەبێ ئەوەی لەسەر کورسیەکەت هەستیت و لەناو ژووری دانیشتنەوە ئەنجام دەدرێت.

ئەمڕۆ خەڵکی جۆرە VRێک لە جۆرە جیاوازەکانی گەمە کۆمپیوتەرییەکان بەکاردەهێنن بەڵام VR لە گەمە زیاترە. فڕۆکەوانەکان ئەوانەی کە فێری چۆنییەتی فڕینی فڕۆکە دەبن دەتوانن بەکاری بهێنن و بە سەلامەتی "Crash" بکەن.

سیستەمەکانی Virtual Reality تەنها شوێنە ناسراوەکانمان نیشان نادەن. بەڵکو جیهانی سەرەنج ڕاکێش و خەیاڵیشمان پیشان دەدەن. خەڵکی لە پێشاندا کاردەکەن بۆ دروستکردنی ئەو جیهانە خەیاڵییە سەرەنج ڕاکێشانە.

# بەشی پێنجەم

# جیهانی کار

ئێمە بەرەو بەجێهێشتنی جیهانی دۆکیومێنتە کاغەزییەکانین.و هەرلەبەر ئەمە کار بەرەو گۆڕانە. کۆمپیوتەری کەسی لە پێشاندا چۆنییەتی کاری گۆڕییوە و ئێستا کۆمپیوتەرەکان بەیەکەوە گفتوگۆ دەکەن و کار زیاتر بەرەو گۆڕانە. ئیحتمالاتەکان زۆر سەرەنج ڕاکێشن، بەڵام خەڵکی پێویستە بیریان بێت کە کۆمپیوتەر تەنها ئامێرێکە. کۆمپیوتەر دەتوانێت لە کۆمەڵێک کێشە یارمەتیت بدات بەڵام ئەم کێشانە لەوانەیە چارەسەر نەبن تەنها لەبەر ئەوەی تۆ کۆمپیوتەرێکت هەیە.




یەکێک لە یەکەم کۆمپیوتەرەکان لەساڵی ١٩٤٠.

کاتێک منداڵ بووم، کۆمپیوتەرەکان ئامێری گەورە بوون و تەنها لە کارە گەورەکان بەکاریان دەهێنان. کۆمپیوتەرەکان بەشێک بوون لە هۆی باش کارکردنی ئەم کارانە بە بەرامبەر بە کارە بچوکەکان کە پێنوس و کاغەز بەکاردەبەن.

بەڵام ئەمڕۆ، کۆمپیوتەرە کەسییەکان ئەمەیان هەموو گۆڕییوە و کارەکان بە هەموو قەبارەکانەوە بەکاریان دەهێنن و یارمەتی بەکارهێنەرەکانیان دەدەن کاری زیاتر بکەن.

ئەمڕۆ، خەڵک لە بازرگانیدا زانیاری دەگۆڕنەوە بە ناردنی پەیام و نامە و گفتوگۆ لەسەر تەلەفۆن هەروەها بە چاوپێکەوتنی خەڵک لە کۆمپانیای ترەوە بە دانیشتن لە چواردەوری مێزەیەک. ئەمە هەمووی دراو و کاتی دەوێت.

لە لەمایکرۆسۆفت دا، ئێمە دەستمان کرد بە بەکارهێنانی ئیمەیڵی ئەلیکترۆنی؛ ئەو نامانەی کە بەکۆمپیوتەرەکاندا گوزەر دەکەن. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ ئیمەیڵ ئەوەی کە زۆربەی خەلکی ناوی دەبەن بەم ناوە شوێنی کاغەزی گرتەوە.

ئیمەیڵ زۆر ئاسانە لە بەکارهێنانیدا و لە کۆمپیوتەرێکەوە بۆ کۆمپیوتەرێک ڕاستەوخۆ گوزەر دەکات. لە مایکرۆسۆفت، هەموو یەکێک لە کۆمپانیادا دەتوانن بە ئیمەیڵ پەیامم بۆ بنێرن. لە

مایکرۆسۆفت پەیامە ئیمەیڵیەکان ئاسایی ڕستەیەک یان دوو ڕستەن. خوێنەر ئەو زانیارییەی دەست دەکەوێت کە پێویستییەتی بەڵام ئەوەندە درێژە ناخایەنێت وەک لە گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی. لە داهاتوودا، ئیمەیڵ باشتر دەبێت بەشێوەیەک کە ئێمە هێشتا بیرمان لێنەکردووەتەوە.

تەلەفۆنەکانیش باشتر دەبن. تۆ گوێ بیستی کەسی تر دەبیت بەڵام ئەگەر کەسی بەرامبەر بیەوێت هەروەها دەتوانیت بیبینیت،  یان تۆ دەتوانیت وێنەی تری نیشان بدەیت لە ڕێگەی هەمان سیستەم.

خەڵکی چاویان بەیەکتری دەکەوێت بەبێ بەجێهێشتنی ئۆفیسەکانیان. من دڵنیام ئێوە لە پێشاندا خەڵکتان بینیوە کە ئەم جۆرە پەیوەندیانەیان لە هەواڵ لەسەر تەلەفیزیۆن بەکارهێناوە. خەڵکی لە وڵاتی جیاوازەوە لەگەل یەکتری گفتوگۆ دەکەن و سەبارەت بە هەمان شت گفتوگۆ دەکەن و ئەمە لەکاتێکدا ڕێپۆرتەر لە شوێنێکی ترەوە پرسیاریان ئاراستە دەکات. کارەکان ئەم سیستەمەیان بەسوود دۆزیوەتەوە چونکە باشتر کاردەکات لە گفتوگۆ تەلەفۆنییەکان. هەروەها ئەم سیستەمە هەرزانتر و خێراتر دەبێت لە هێنانی خەڵک بۆلای یەکتر لە سەرتاسەری وڵات یان لەسەرتاسەری جیهان.

بەشێک تری کار هەیە کە پێشتر لە گۆراندایە. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ملیۆنانی خەڵکی کاردەکەن بێ ئەوەی هەموو

ڕۆژێک بچنە ئۆفیسێک. ئەوان لەماڵەوە کارەکانیان دەکەن بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەرەکان وئیمەیێل و ئامێرە فاکسییەکان. کاتێک تۆ لەشوێنێک کاردەکەیت و پاشان کارەکەت بۆ شوێنیک تر دەنێریت ئەوا تۆ پەیوەندی (Telecommuting) دەکەیت. ئەو خەڵکانەی کە ئەمە دەکەن پێیان دەوترێت پەیوەندیکارەکان (Telecommuters) و خەڵکی زیاتر و زیاتر لە داهاتوودا پەیوەندی دەکەن بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت.

بۆ ئەم سیستەمە نوێیەی پەیوەندی کردن بۆ باشتر کارکردن، کارەکان باشتروایە بیر لە دۆزینەوەی ڕێگەی نوێ بکەنەوە بۆ کاتی کارکردن. کاتێک کە تۆ لەناو ئۆفیسێکیت ، کۆمپانیا کرێی هەر کاتژمێرێکت پێ دەدات لەو کاتەی کە بونت لەوێ هەیە. کاتێک تۆ لە ماڵەوە بە پەیوەندی کردن کاردەکەیت ، کاتی زیاتر بۆ چاودێری کرنی منداڵەکان ویان کردنی کارەکانی تر دەبێت. کاتێک ئەمە ڕوودەدات پەیوەندی کارەکان بە کۆمپیوتەرەکانیان دەڵێن و کۆمپیوتەرەکانیش بە ئۆفیسەکان ڕادەگەیەنن کە ئەوان لەم کاتەدا کارناکەن.

کۆمپانیاکان بچوک دەبنەوە بە بەکارهێنانی پەیوەندی کارەکان لە کاتی پێویستی ئەواندا. کەواتە گەورە هەمیشە باشتر نییە لە بازرگانیدا.

زۆربەی زۆری پەیوەندی کارەکان بۆ زیاتر لە کۆمپانیایەک کاردەکەن. ئەوان خشتەی کارکردنیان دەخەنە ناو کۆمپیوتەرەکانیان و بازرگانییەکانی تریش دەزانن چ کاتێک کاتیان بەتاڵە بۆ ئەوەی بۆ ئەوان کاربکەن.

پەیوەندی کردن(Telecommuting) لەزۆر ڕووەوە ژیانمان دەگۆڕێت. کێشەکانی ئەمڕۆ کێشەی شارەکەن، زۆربەی خەڵکی لە هەمان شوێن دەژییەن لەبەر ئەوەی ناتوانن لەوێ کار بدۆزنەوە.

بە دڵنیاییەوە شتانێکی باش هەن سەبارەت بە ژیان لە شار. شتی زیاتر هەیە بیبینیت و بیکەیت وهەروەها نەخۆشخانەو خوێندنگاکان گەورەترن و تەنانەت باشتریشن. بەڵام کاتێک خەڵکی ژیان لە شار هەڵدەبژێرن ، ئەوان لە خراپدا دەژییەن بۆ ئەوەی باشیان هەبێت.

بە تێپەڕبوونی کات، لەگەڵ ئەوەی ئینتەرنێت کارەکەت بۆ دێنێتە ماڵەوە، شتی باشترت لە شار لەگەڵ خۆی بۆ دێنێت؛ وەکو وانەکانی کۆلێژ و گەشتەکانی شار یان گفتوگۆ لەگەڵ پزیشکەکانی نەخۆشخانە لە دوورەوە. کاتێک ئەمە ڕوودەدات بەجێهێشتنی شار لەلایەن خەڵکەوە شیاو دەبێت. نامۆ دیارە بەڵام ئەمەش دەبێتە یارمەتیدەر بۆ شارەکان. ئەگەر یەک کەس لە دە کەس لە شار بژیەت، شارەکە دراوی زیاتری دەبێت بۆ بەسەربردنی لەسەر ٩ کەسەکەی تر.

# بەشی شەشەم

## بازاڕەکان و دراو

کاتێک ئادەم سمیث لە ساڵی ١٩٧٧ سامانی نەتەوەکانی نوسی، ئەو باسی جیهانێکی کرد کە هەموو کڕیارێک نرخی هەموو فرۆشیارێک دەزانێت و هەموو فرۆشیارێکیش دەزانێت چەندی بۆ داوابکات.

ئێمە هێشتا ئەم جیهانەمان نییە. هەندێک کات تۆ شتێک دەکڕیت بە ٥٠٠ دۆلار و لە کۆگایەکی تر دەیبینیت بە ٣٠٠ دۆلارە، لەم کاتەدا تۆ هەست بە گەمژەیی دەکەیت. ئەمە لە کۆمەڵێک شتدا ڕوودەدات.، بەڵام بە بوونی هەمان هۆ چونکە تۆ زانیاری تەواوت نەبوو.

ئینتەرنێت کڕیاری و فرۆشیارەکان بۆ لای یەک دەهێنێت. تۆ دەتوانیت بازاڕ بۆ هەموو شتێک بکەیت بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەرێک. کە ئەمە ڕوو دەدات، چینی ناوەڕاست ئەم خەڵکانەی کە بۆ خەڵکی تر شت دەفرۆشن، پێوست دەکات لەسەریان کە زیاتر بۆ هەردوولا هەم فرۆشیارەکان و هەم کڕیارەکان بکەن بۆ پاراستنی کارەکانیان.

ئەم بیرۆکەیە زۆربەی خەڵکی دەترسێنێت بەڵام ئەم ترسانە دەوەستێت کاتێک دەبێتە بەشێک لە ژیانمان. ئێمە داوای زیاتر و دەستکەوتی زیاتر لە چینی ناوەڕاست دەکەین.

گەشتی بازرگانی بریتییە لە بازرگانی چینی ناوەڕاست. ئەو خەڵکانەی لە ئۆفیسی گەشتن پێوست دەکات توندتر کاربکەن بۆئەوەی کڕیارانیان بهێڵنەوە. بەدەست هێنانی زانیاری گەشت کردن ئاسانتر دەبێت لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە و زۆربەی خەڵکی دەست دەکەن بە پلان دانان بۆ گەشتەکانیان.

لەسەر ئینتەرنێت، زۆربەی خەڵکی ڕاستەوخۆ شتەکانیان لە کۆمپانیای بەرهەمهێنەرەوە دەکڕن. هەر لەبەر ئەمە ڕیکلامکردن دەگۆڕێت و کاتێک کە تۆ وا هەست دەکەیت ئەو شتەی تۆ دەیکڕیت زۆر باش نییە یان کاتێک بەڕاستی ئارەزووی ئەو شتە دەکەیت ئەوا دەتوانیت سەبارەت بەمە لەسەر بۆردەکانی ئەلیکترۆنی بولیتێن پرسیار لە کڕیارانی تر بکەیت. هەروەها پێش ئەوەی تۆ شتێک بکریت، دەتوانیت لەسەر بۆردەکانی بولیتێن قسەی خەڵکی لەسەر ئەم بەرهەمە بخوێنیتەوە.

بە دڵنیاییەوە تۆ نابێت گوێ لە هەمووشتێک بگریت ئەوەی خەڵکی لەسەر بولیتێن بۆرد دەیلێت. هەندێک کات، کەمێک لە بەکارهێنەرەکان بە توندی هەوڵدەدەن بە خەڵکی بڵێن چۆن هەست دەکەن. پەیامەکانیان هەڕەشە ئامێز دەبن. من زۆر ئەوەم لەسەر بۆردەکانی بولیتێن بۆرد بینیوە و هەر ئەوەش بولیتێن بۆرد لەناو دەبات.

کێشەیەکی تریش لە بولیتێن بۆردەکان هەیە. ئەمڕۆ، ئەگەر یەکێک بەردەوامبێت لە تەلەفۆنکردن بۆ تۆ و تۆش ئارەزووت نەکرد گوێبیستیان بیت، ئەوا کۆمپانیای تەلەفۆن و پۆلیس بەیەکەوە کاردەکەن بۆ ڕاگرتنیان. بەڵام هیچ یەکێک لە کۆمپانیای تەلەفۆن توڕەنابیت بەڵکو لە کەسی تەلەفۆنکار توڕە دەبن.

*لە داهاتوودا بەدەست هێنانی زانیاری گەشت کردن ئاسانتر دەبێت لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە و زۆربەی خەڵکی دەست دەکەن بە پلان دانان بۆ گەشتەکانیان.*

ئەمە بەلایەنی ڕۆژنامەکانەوە جیاوازە. ئەگەر ڕۆژنامەیەک سەبارەت بە تۆ درۆ بلێت ئەوا ڕۆژنامەکە لە کێشەدا دەبێت.

کۆمپانیاکانی ئینتەرنێت لە ناوەڕاستی ڕۆژنامە و کۆمپانیاکانی تەلەفۆن دەبن. ئەوان زانیاری بە ئێمە دەدەن بەڵام زانیاریشمان بۆ دەهێنن کە خودی خۆیان نەیان نوسیبووە، چۆن کێشە لەگەڵ پەیامەکانی سەر بولیتێن بۆرد هەبووە ئەوەندەش کێشە لە گەڵ بولیتێن بۆردەکان هەبووە. هەندێک لە بەکارهێنەران توڕەبوون لەسەر ئەو شتانەی بەکاربەری تر لەسەر بولیتێن بۆردیان داناوە. ئایا ئەمە مانای وایە کە کۆمپانیای ئینتەرنێتەکە دەکەوێتە کێشەوە؟ وەڵام هیشتا ڕون نییە.

من باوەڕم وایە لە کۆتایدا ئێمە زانیاری لەسەر ئینتەنێت دادەنێن و دەیکەینە دەستەی جیاوازەوە. لە هەندێک دەستەدا، لەوانەیە زانیاری هەبێت و کۆمپانیاکە خوێندبێتییەوە  و گۆڕیبێتی ئەگەر پێویست بوبێت. لە هەندێک دەستەی تر، پەیامەکان لەوانەیە ڕاستەوخۆ لە بەکارهێنەری ترەوە بێت.

بەڵام بولیتێن بۆردەکان نابنە تاکە شوێن بۆ دۆزینەوەی زانیاری سەبارەت بەو شتانەی کە تۆ دەتەوێت بیان کڕیت. ئەمڕۆ، تۆ دەتوانیت خەڵکی لەناو فیلم ببینیت جۆرێک لە خواردنەوە بخواتەوە یان لە ڕیستۆرانتێک خواردن دەخوات کە تۆ زانیاریت دەربارەی هەیە. ئەمە

جۆرێک نوێی ڕیکلامکردنە. لە فیلمی True Lies ئەرنۆڵد شوارزێنیگەر پڕۆگرامییێکی ویندۆزەکەی ئێمەی بە عەرەبی لەسەر شاشەیەکی کۆمپیوتەر دەبینێت. ئێمە بۆ ئەمە کرێمان دا. لە داهاتودا کاتێک تۆ شتێک لە فیلمێک دەبینیت و ئارەزووی دەکەیت، ئەو کات تۆ دەتوانیت پرسیاری سەبارەت بکەیت یان لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە بیکڕیت. ئەگەر هۆتێلێکی جوان هەبوو لە فیلمەکەدا ئەوا تۆ دەتوانیت بزانیت ئەم هۆتێلە لە کوێ یە و نرخی کرێی ژوورەکانیش چەندە. هەروەها تۆ ئەوەش دەتوانیت کە لەم کاتەدا فیلمەکە ڕابگریت وپاشان دەست بە فیلمەکە بکەیتەوە کاتێک تەواو بویت.

بیرۆکەییەکی تر کە لەپێشاندا دەستی پێکردووە و بیرۆکەی بازارکردن دەگۆڕێت. کۆمپانیای جل و بەرگی Levi Strauss هەوڵی سیستەمێکی نوێ دەدات بۆ فرۆشتنی پانتۆڵەکانی. لە زۆربەی کۆگاکانی دا دەتوانی پێیان بڵێیت کە تۆ تا چەند دەتەوێت قەبارەی پانتۆڵەکەت گەورەبێت و درێژی قاچەکانی چەندبێت، لەم کاتەدا کۆمپیوتەرەکەیان قەبارەکان دەنێرێت بۆ کارگە و لەوێوە کۆمپیوتەرێکی تر بە ئامێرەکانی بڕین دەڵێت و پاشان جوتێک پانتۆڵی تایبەت و تەنها بۆتۆ دروست دەکەن.

لەم کاتەدا، بۆ هەموو کەسێک شیاودەبێت کە زانیارییەکانی جل و بەرگی لە کۆمپیوتەرەکەیدا بێت. کاتێک ئەمە ڕوو دەدات زۆر ئاسان

دەبێت دیاریەک بۆ کەسێک بکڕێت چونکە تۆ دەزانیت جلوبەرگەکان قەبارەکانیان تەواوە.

هەروەها تۆ دەسەلاَتی ئەوەشت دەبێت کە بە کۆمپیوتەرەکەت بلّێیت سەبارەت بەشتی تر کە تۆ دەتەوێت بیان کڕیت. کۆمپیوتەرەکەت کاتێک شتێکی سەرەنج ڕاکێش دەدۆزێتەوە بە تۆ ڕادەگەیەنێت. هەروەها کۆمپیوتەرەکەت ئەمە بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی سەبارەت بە تۆ بە کۆمپانیاکان ڕابگەیەنێت. ئەمە بۆ هەردوو لاتان تۆ و کۆمپانیاکانیش بەسوود دەبێت.

ئەمڕۆ، ڕیکلامکردن بۆ کۆمپانیاکان کرێیەکی زۆری تێدەچێت. هەندێک کۆمپانیا هەن بۆ نمونە کۆکا کۆلا کە دەیانەوێت هەموو کەسێک ڕیکلامەکانیان ببینێت. بەلاَم زۆربەی کۆمپانیاکان دەیانەوێت ریکلامەکانییان بگاتە دەستەیەک لە خەلّک یان دەستەیەکی تر. بۆ نمونە، کۆمپانیاکانی گەمەی مدالاَن دەیانەوێت مندالاَن یان دایک و باوکی مندالاَن ریکلاَمەکانیان ببینن. کۆمپانیاکانی ئۆتۆمۆبیل دەیانەوێت شۆفێران ڕیکلامەکانیان ببینن. و ئەو کۆمپانیایانەشی کە ئۆتۆمۆبیلی گرانبەها دروست دەکەن دەیانەوێت شۆفێرە دەولّەمەندەکان بەرهەمەکانیان ببینن.

کاتێک کۆمپانیاکان زیاتر سەبارەت بە تۆ دەزانن، تۆ پێویست ناکات تەماشای ئەو ڕیکلامانە بکەیت کە تۆ ئارەزووت لێیان نییە. هەروەها کۆمپانیاکان دەزانن کە تەنها خەڵکانێک ڕیکلامەکانیان دەبینن کە دەیانەوێت شتەکانیان بکڕن.

کۆمپیوتەرەکەت بە کۆمپانیاکان دەڵێت کە تۆ ئارەزووی چ دەکەیت بیکڕیت. یان ئارەزووی چی دەکەیت ببیستیت.

ئەو کۆمپانیایانەی کە میوزیک دەفرۆشن ڕێگەی نوێیان دەبێت بۆ بازرگانیکردن. تۆ توانای ئەوەت دەبێت کرێ بدەیت بەرامبەر بەهەر جارێک گوێگرتن لە گۆرانییەک. یان کۆمپانیاکە توانای ئەوەی دەبێت کە نرخێکی هەرزانترت پێ بدات بەرامبەر بە دەجار لێدانی گۆرانییەکە، یان لەوانەیە هەندێک کات تۆ بتوانیت بە خۆڕایی گوێبیستیان بیت. کۆمپانیاکانی فیلمیش هەمان شت دەکەن.

هەروەها لەداهاتوو pay-messages دەبێت، ئەمانە پارەت پێدەدەن گەر تۆ لێیان بڕوانیت. بە دڵنیاییەوە، زۆربەی ئەوانە لەوانەیە پارەیەکی زۆرت پێنەدەن. لەوانەیە چواریەک یان دۆلارێک بێت. بەڵام کاتێک کەسێک بیەوێت بە تایبەتی لێیان بڕوانێت لەوانەیە ئەم کاتە زیاترت دەست بکەوێت. ئەم جۆری pay-messagesانە دەبنە جۆرێکی تری ڕیکلام کردن لە داهاتوودا.

بانکەکانیش پێویستە بگۆڕێن. نزیکەی ١٤ هەزار بانک بۆ بانککردنی کەسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەن. زۆربەی خەڵکی لە نزیکماڵەکانیان یان ئۆفیسەکانیان بانک بەکاردەهێنن. بەڵام لەگەڵ ئەوەی ئینتەرنێت گەشەدەکات پێویست نابێت لە نزیک ماڵەکەتەوە بانک هەبێت. لە داهاتوودا بانکی ئەلیکترۆنی دەبن _کۆمپیوتەرەکان چاودێری دراوی تۆ دەکەن_ و ئەم بانکانەش لە هەموو شوێنێک دەبن چونکە ئەوان لەناو کۆمپیوتەرەکەی تۆش دەبن.

لە داهاتوودا، زۆربەی کۆمپانیاکان لەکاتی هاتنی ئینتەرنێتدا پێویست دەکات بگۆڕین. هەندێک کاری کۆن ون دەبن بەڵام چەندین کاری نوێ جێگایان دەگرنەوە و لەمەشدا کڕیار و فرۆشیارەکان براوە دەبن.

# بەشی حەوتەم

## پەروەردە و فێربوون لە داهاتوودا

بازرگانییەکان جیاواز دەبن و خوێندنگاکانیش پێویستە بگۆڕێن.

هۆوارد گاردنەر لە Harvard Graduate School Education دەڵێت پێویستە تۆ هەر منداڵێک بەڕێگەیەکی جیاواز فێربکەیت چونکە خەڵکی جیهان بە جیاواز دەبینن.

هەندێک لە مامۆستایان لە پێشاندا ئینتەرنێتیان بەکارهێناوە. زۆرینەی مامۆستایان دەمێکە کۆمپیوتەری کەسی بەکاردەهێنن. لە Union City لە New Jersey کۆمپانیایەکی تەلەفۆن پێی دەڵێن Bell Atlantic ١٤٠ کۆمپیوتەری بەخشییە خوێندکاران و مامۆستایان. ئەم کۆمپیوتەرانە ناردرانە ماڵەوە و خوێندنگاکان. لە ماڵەوە، خوێندکاران بەکاریان هێنان بۆ ئەرکی ماڵەوەیان. باوک و دایکانیش بەکاریان هێنان بۆ قسەکردن لەگەڵ خوێندنگا سەبارەت بە منداڵەکانیان.

دۆکیومێنتە ئەلیکترۆنییەکان یارمەتی مامۆستایان دەدەن لە پێدانی بەشی جیاواز لە هەمان وانە بە خوێندکاری جیاواز. هەموو منداڵەکان بەم ڕێگەیە فێردەبن کە باشترینە بۆ ئەوان.

زۆبەی خەڵکی باوەڕ بەوە ناکەن. ئەوان سەبارەت بە کۆمپیوتەرەکانیان بیستووە لە پۆلەکاندا. بەڵام جیاوازی زۆریان نەبینیووە تەنها لەبەر بوونی کۆمپیوتەرەکان. هۆیەکی سادە هەیە بۆ ئەمە ئەویش پارەیە! خوێندنگاکان پارەی تەواو وەرناگرن بۆ ئەوەی کۆمپیوتەری گونجاوی پێ بکڕن. کۆمپیوتەری خوێندنگاکان ئەوەندە زیرەک و بەهێزنیین بۆ ئەنجام دانی کارەکانیان. بەڵام ئەوە دەگۆڕیت چونکە پێویستە بگوڕیت. کۆمپیوتەرەکان ئەمڕۆ لەماڵەوەن پێوستە بەیانی لە خوێندنگاکان بن.

زۆرجار خەڵک پرسیار دەکەن "ئایا کۆمپیوتەرەکان جێگای مامۆستایان بگرنەوە؟" من دەتوانم وەڵامیان بدەمەوە "نەخێر ناتوانن جێگایان بگرنەوە!" کۆمپیوتەر ئامێرەکە کە مامۆستا بەکاریدەهێنێت.

ئێمە هەمووومان مامۆستامان هەبووە کە جیاوازی لە ژیانماندا دروست کردووە. بەڵام کاتێک مامۆستاکان کاری باشی خۆیان دەکەن و وانە سەرەنج ڕاکێشەکانیان دەڵێنەوە ئەوان تەنها یارمەتی ٢٠ یان ٣٠ خوێندکار دەدەن. لە داهاتوودا، مامۆستایان کارەکانیان لەگەڵ خوێندگاکانی تر لەسەرتاسەری وڵات شێردەکەن یان لەتەواوی جیهان شێری دەکەن.

لەداهاتوودا، نەرمەکاڵای باش بوونیان دەبێت بۆ وانەکان. بۆ نمونە، کاتێک مامۆستایەک سەبارەت بە خۆر دەدوێت ئەوە دەتوانێت وێنەیەک

لەناو ژمارەیەک وێنە هەڵبژێرێت. ئەو وێنەی تریشی لادەبێت کاتێک خوێندکاران پرسیار ئاراستە دەکەن. لەدوای وانەکە، خوێندکارەکان دەتوانن بەدوای ڕاستی زیاتر بگەڕێن لەسەر کۆمپیوتەرەکانیان.

لەداهاتوودا، پڕۆگرامی تریش بوونیان دەبێت بۆ یارمەتیدانی مامۆستایان. بۆ هەرخوێنکارێک مامۆستاکە پرۆگرامێکی تایبەت بە زانیارییەوە سەبارەت بە خوێندکارەکەی دەبێت. مامۆستاکان دەتوانن باشتر لەگەڵ خوێندکاران و دایک وباوکیان کاربکەن کاتێک زانیاری زیاتریان دەبێت لەسەر ئەو خوێندکارە.

کۆمپیوتەرەکان دەتوانن لە تاقیکردنەوەکانیشدا یارمەتیدەربن کە تاقیکردنەوە یەکێکە لە ترسناکرین شتەکانی خوێندنگا. زۆرینەی خوێنکاران لە تاقیکردنەوە دەترسن. خوێندکارێک کە لە تاقیکردنەوەکان باش نابێت زۆرجار وای لێدەێت کە بە شێوەیەکی گشتی لە خوێندنگا بترسێت.

لەگەڵ کۆمپیوتەرەکان خوێندکاران دەتوانن لە هەرکاتێکدا بە ئامادەبوونی مامۆستا و بەبێ مامۆستا تاقیکردنەوە وەربگرن. کاتێک خوێندکاران هەڵەیەک دەکەن، کۆمپیوتەرەکە یارمەتیان دەدات. پاشان کە مامۆستا تاقیکردنەوە دروستی خۆیان پێدەدات، خوێنکاران بیرۆکەی باشتریان دەبێت لەوەی کە دەیزانن.

هەموو خوێندنگایەک پەرتووک خانەیەکی ناوازەی دەبێت. چونکە ئینتەرنێت بە ملیۆنان پەرتووک دەهێنێتە سەر شاشەی کۆمپیوتەری خوێندنگا. هەروەها دۆکیومێنتی ئەلکترۆنیش دێنێتە ناو کۆمپیوتەری خوێندنگا، بۆ نمونە زانیاری نامە. خوێندکاران دەتوانن پرسیارەکانیان بکەن و وەڵامیش سەبارەت بە زۆربەی شتەکانن وەربگرن.

*ئینتەرنێت بە ملیۆنان پەرتووک دەهێنێتە سەر شاشەی کۆمپیوتەری خوێندنگاکان.*

هەندێک لە دایک وباوکان دڵخۆشنیین کاتێک منداڵەکانیان لەبەردەمی کۆمپیوتەرەکانیان دەبینن. ئەوان دەڵێن "برۆ پەرتوکێک بخوێنەرەوە،" بەڵام دایک و باوکان تەنها بیر لە گەمەکانی کۆمپیوتەر دەکەنەوە. لە داهاتوودا ، پەرتووکەکان لە ناو کۆمپیوتەری منداڵەکەدا دەبن.

هەبوونی ئەم هەموو زانیارییە تەنها وەڵامێک نییە بۆ ئەو کێشانەی کە زۆربەی خوێندنگاکانی ئەمڕۆ هەیانە بەڵام یارمەتی دەردەبن. خوێندنگاکانمان گرنگترین شوێنن بۆ ئێمە بەڵام شوێنی تری گرنگیش هەن کە خەڵکی تێیداندا فێردەبن. خەڵکی لە هەموو شوێنێک دەتوانن لە مامۆستا گەورەکان فێرببن و خەڵکی لە هەموو تەمەنەکان دەتوانن بڕۆنە خوێندنگا لە هەر کاتێک ئەوان لەبەردەمی کۆمپیوتەر دادەنیشن.

# بەشی هەشتەم

## ماڵێک بۆ داهاتوو

زۆربەی خەڵکی وا بیردەکەنەوە کە کۆمپیوتەرەکان ئەو کاتەمان دەگرن کە ئێمە لەگەڵ هاوڕێیانمان بەسەری دەبەین. هەندێک تر وا هەست دەکەن کە ئێمە زۆر پێی ئاسوودە دەبین و نامانەوێت بەجێی بهێڵین. هەندێکی تریش باوەڕیان وایە کە کاتێک ئێمە دەست دەکەین بە دەمەتەقێ لەگەڵ کۆمپیوتەرەکان ئێمە لە گەڵ خەڵکی لە گفتوگۆ دەوەستین. کە من باوەڕم بەوەیان نییە.

لە ساڵی ١٩٩٥، خەڵکی وتیان شانۆی فیلمەکان دەمرن و تەلەفیزیۆنەکان لەناویان دەبەن. بەڵام تا ئێستاش شانۆی فیلمەکان هەر ماون و خەڵکی هەموو کات پێشبینییەکانیان ڕاست نیین!

لە ڕاستیدا، ئینتەرنێت زۆربەی هاوڕێ کۆنەکان بۆ ئێمە دەگەڕێنێتەوە. زۆر ئاسانتر دەبێت بۆ هێشتنەوەی ئەو هاوڕێیانەی کە کۆچیانکردووە چونکە ئێمە دەتوانین زیاتر لە جاران بۆیان بنوسین و قسەیان لەگەڵ بکەین کە تێچونیشی کەمترە. هەروەها ئینتەرنێت یارمەتی ئێمە دەدات کە هاوڕێی نوێ دروست بکەین. زۆربەی گفتوگۆکانت لەسەر کۆمپیوتەر دەست پێدەکات بەڵام دەست بەجێ ئارەزووی چاوپێکەوتن دەکەیت.

هەندێک لە دایک و باوکان لە ئینتەرنێت دەترسن چونکە دەبێتە شوێنێک کە منداڵەکانیان دەتوان سەبارەت بە هەرشتێک بیانەوێت فێرببن، باش یان خراپ. ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە.

چی دێتە ناوماڵەکە جیاوازە بەڵام ماڵەکەش هەر جیاواز دەبێت. ئێمە زۆربەی ئەوشتانەی ئێستا هەمانن پێویستمان نابن؛ فەرهەنگ وزانیارینامە کاغەزییەکان و سیدیەکان و سەرپۆش و پەیامە کۆنەکان و وێنە کۆنەکانیش. هەموو ئەم شتانە وندەبنە ناو کۆمپیوتەرێک. ئێمە نامانەوێت لە دەستیان بدەین. ئەوان پارێزراو دەبن لەناو کۆمپیوتەرەکانمان. بەڵام ئێمە کاتێک دەمانەوێت تەماشای شتێک بکەین هەڵدەبژێرین و هەڵبژاردەمان دەبێت.

من سەبارەت بەم هەموو شتانە بیردەکەمەوە چونکە من لەم دواییانە بوو خانوویەکی نوێم دروست کرد. خانووەکەم خانوویەکە بۆ داهاتوو. بەڵام زۆربەی زۆری ئەم خانووە زۆر ئاسوودە دیارە. ئەم شوێنەیە کە خێزانەکەم و من تێیدا دەژییەین. خانووەکەم لە تەختە و شوشە و بەرد دروستکراوە. هەروەها خانووەکە لە نەرمەکاڵاش دروستکراوە.

ئەگەر بێیت و سەردانێک بکەیت، لەوانەیە لەکاتێک دێتە ناوەوە سەرت بسوڕمێت. کەسێک دەموسێکی ئەلیکترۆنیت پێ دەدات کە بیکەیت بەخۆتدا. ئەم دەموسە بە خانووەکە دەڵێت تۆ کێیت و لە کوێوە

هاتوویت.




*Control Console*

خانووەکە ئەم زانیارییە بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی ئەوەت بداتێ کە تۆ پێویستتە. کاتێک لە دەرەوە تاریکە ئەوە دەموسەکە نزیکترین گڵۆپەکان لە تۆوە دادەگیرسێنیت و پاشان دەشیان کوژێنێتەوە لە کاتێک کە لێیان دورکەویتەوە. میوزیکیش لەگەڵ تۆ دێت و دەچێت. ئەگەر خانووەکە مۆسیقای دڵخوازی تۆی زانی ئەوا لێی دەدات. وا پێدەچێت کە مۆسیقا لە هەموو شوێنێک بێت، بەڵام لە ڕاستیدا هەندێک خەڵکی تر

لە ماڵی تر گوێیان لە مۆسیقای جیاواز دەبێت یان هەر مۆسیقای لێ نییە. کاتێکیش کە تەلەفۆن زەنگ لێدەدات ئەوا نزیکترین تەلەفۆن لە تۆوە زەنگ لێدەدات. بە دڵنیاییەوە، تۆ دەتوانیت کە بە خانووەکە بلێیت ئەگەر شتێکت پێویست بوو. لەوێ Control Console یێک هەیە کە ئامێرێکە شتەکانی دەوروبەرت دەکوژێنێتەوە و دایان دەگیرسێنێت.

دەموسەکە و Control Consoleکە بیرۆکەی تازەن، بەڵام ئەوانیش وەکو زۆربەی ئەم شتانەن کە ئێستا هەمانن. ئەگەر ویستت بڕۆی بۆ سینەمایەک ئەوا پێویستت بە بلیتە. ئەگەر من کلیلی ئۆتۆمۆبیلی خۆمت بدەمێ ئەوا ئۆتۆمۆبیلەکە ئیش دەکات چونکە کلیلەکانت لایە. خانوەکەمیش بۆ تۆ کاردەکات چونکە تۆ دەموسەکەت کردووە بە خۆتدا یان Control Consoleەکەت هەڵگرتووە.

من باوەڕم وایە لە دە ساڵی تردا، زۆربەی ماڵە نوێکان ئەم سیستەمەیان دەبێت کە من بۆ خانووەکەی خۆمم داناوە. لەوانەیە سیستەمەکە گەورەتر و باشتریش بێت لەوەی من کە ئەمڕۆ دامناوە.من ئارەزووی تاقی کردنەوەی بیرۆکەی نوێ دەکەم، من دەزانم کە زۆربەی بیرۆکەکانم باشترکاردەکەن لە هی ئەوانی تر. بەڵام من خۆزگە دەخوازم بە ڕۆژێک کەچیتر بیر لەم سیستەمانە بە نوێ نەکەمەوە و لە جیاتی ئەمە پرسیار لە خۆم بکەم "چۆن بتوانم بەبێ ئەم سیستەمانە بژییەم؟"

# بەشی نۆیەم

## ئینتەرنێت "چەرخی زێڕی"

لە ساڵی ١٩٩٤  و سەرەتایی ١٩٩٥، کاتێک چەندین نوێخوازی لە زانیاری ڕێگەبەزەکە هەبوون، پێ دەچوو کە زۆربەی زۆری ڕۆژەکان کۆمپانیایەک یان یەکێکی تر هەوڵی ئەوە بدات بۆ ئەوەی ببێتە بەشێک لە پلانەکان بۆ دروستکردنی زانیاری ڕێگەبەرزەکە ،بۆنمونە  ببێتە یەکەم لە پێشکەش کردنی ڤیدیۆ بە بەکارهێنەران لەڕێگەی تەلەفیزیۆنی کەیبڵی یان سیستەمی تەلەفۆنە ڤیدیۆییەکان.

ئەم سەرسوڕمانانە وەکو خەونێکی زۆرخۆش بوون. کۆمپانیا گەورەکان وبچوکەکانیش هیواخوازبوون کە بڕە پارەیەکی زۆر دەست بخەن بە ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان و بیرۆکەکانی دروستکردن و ئیشپێکردنیان بۆ ئینتەرنێت. هەموویەکێک ویستی سەرکەتووبێت. بەڵام ئەوان شوێنی کۆمپیوتەری کەسیان نەبینی بۆ داهاتووی ئەمە.

پاشان، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٥، خەڵکی پێدەچوو هەست بە ئینتەرنێت بکەن. پەیوەندی لە کۆمپیوتەرێکی کەسییەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر - لە ئۆفیسێکەوە بۆ ئۆفیسێکی تر و لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر یان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر لەسەرتاسەری جیهاندا – جوڵەیەکی ڕوونی بەرەوپێشچوونی داهاتووی زانیاری ڕیگا بەرزەکە بوو. خۆشییەکان

لەسەر دروستکردنی ئینتەرنێت بە خێرایی ڕووی وەرگێڕایە سەر خۆشیەکان لەسەر هێزێک کە خەڵکی پێشتر هەیانبوو لە ڕێگەی کۆمپیوتەرە کەسییەکانەوە لەسەر ئینتەرنێت. ئینتەرنێت بەخێرهاتنێک بوو بۆ گۆانکاری بیرکردنەوە لە مایکرۆسۆفت، کە لەپێشدا بیرکردنەوە و پلانەکانمان بریتییە بوو لە "کۆمپیوتەری کەسی لەسەر هەر مێزێک و لەهەموو ماڵێکدا."

پلانەکان لە کۆمپانیاکانی پەیوەندی و کۆمپیوتەر و نەرمەکاڵا بەخێرایی گۆڕا. بیرۆکەکانیان خستە گەڕ بۆ زانیاری ڕێگا بەرزەکە و دەستیانکرد کە بە ورییاییەوە مامەڵە لەگەڵ "تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی جیهانی" بکەن کە خەڵکی لە پێشتر بەکاریان دەهێنا. کۆمپانیاکان بە خێراییی دەستیان کرد بە دروستکردنی ڕەقەکاڵا و نەرمەکاڵای کۆمپیوتەرەکان تایبەت بە ئینتەرنێت بۆ پێدانی ڕێگەی نوێ بە بەکارهێنەران بۆ نمونە ڕێگەی نوێ لە ناردن و بەدەستهێنانی زانیاری لە سەر زۆربەی هەرە زۆری بابەتەکان و بازرگانی کردن و دروستکردنی هاوڕێیان.

نەرمەکاڵاکانی ئینتەرنێت هەتا ئێستا و هەموورۆژێک باشتر و بەهێزتردەبن و لە داهاتوویەکی نزیکدا ڤیدیۆکان و سیستەمەکانی تەلەفۆنیش لەسەر ئینتەرنێت ئیشیان پێدەکرێت هەروەکو خەڵکی بیریان لێکردەوە کاتێک ئەوان لەساڵانی ڕابردوو پلانیان بۆ زانیاری ڕێگا بەرزەکە دادەنا.

ڕۆژە زووەکانی ئینتەرنێت وەکو ڕۆژە زووەکانی چەرخی زێری کالیفۆڕنیا وان، خەڵکی پارە بە ڕێگەی سەرسوڕهێنەر پەیدادەکەن.

لە ساڵی ١٩٨٢، نزیکەی سێ ساڵ لە دوای دەستپێکردنی چەرخی زێری، هەزاران لە پیاوان هیوایان خواست کە زێر بدۆزنەوە و بە خێرایی دەوڵەمەندبن. پیاوێک کە ناوی لیڤای ستروس بوو کۆگایەکی لە سانفرانسیسکۆ کردەوە. بیست ساڵ دواتر، لە کاتێکدا خەڵکی هەر خەونیان بە دۆزینەوەی زێڕ دەبینی، پیاوێکی تر کە خەڵکی نێڤادا بوو بیرۆکەیەکی پێشکەشی لیڤای ستروس کرد کە بریتی بوو لە جۆرێکی نوێی کابۆ دروستکراو لە ڕەنگی شین بەڵام بەهێز. ئەوان ڕازیبوون کە بەیەکەوە بچنە ناو بازرگانییەوە _ ئەوان دەوڵەمەند بوون بەڵام لەڕێگەی زێرەوە نەبوو. لەم کاتەوە وپاشان کۆمپانیاکەی لیڤای ستروس زیاتر لە ملیارێک کابۆی لەسەرتاسەری جیهاندا فرۆشت _ کە دەتوانیین بلێین زێڕی شیین!

زۆربەی هەرە زۆری هەریەکێک لە ئێمە ڕۆژێک دەبێت شێری دەوڵەمەندەکانی ئینتەرنێت بکات. ئینتەرنێت گەشدەکات بەشێوەیەک کە زۆربەی هەرەزۆری هەریەکێک لە ئێمە لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان و ڕێژەیەکی زۆری وڵاتە هەژارەکانیش دەبنە بەکارهێنەر. مایکرۆسۆفت لە پێشەوە کار بەرەو ئەم ئامانجە دەکات.

## بەشی دەیەم

## جوڵان بەرەو چونەناوەوەی چەرخی زانیاری

ئەمە ساتێکی سەرسوڕهێنەرە لە جیهانی کۆمپیوتەرەکان و زانیاریدا. ئەمە سەرەتایەکە و شتە نوێکان بەرەو دەرکەوتنن و پیشەی نوێیان لەگەڵ دێت.

من خۆزگەی شتی گەورە دەخوازم لە داهاتوو بەڵام من کەمێکیش دەشڵەژێم. کرێکارەکان پێویست دەبێت ئەم کارە نوێیانە فێرببن. وڵاتەکان زیاتر لەیەکتری نزیک دەبنەوە و ئەمەش ڕێگەی بیرکردنەوەمان سەبارەت بەوڵاتانی دراوسێ دەگۆڕێت. کێشەی نوێ دەبن بەڵام ئەمڕۆ تەنها دەتوانیین هەستیان پێبکەین کە ئەم کێشانە چی دەبن.

هەندێک کات، لەگەڵ گۆڕینی هەموو شتەکان، پێدەچێت کە جیهان بەتەواوی لە ڕۆژێک بۆ ڕۆژێکی تر جیاواز دەبێت. ئەمە لەوانەیە وانەبێت بەڵام پێویستە ئێمە ئامادەبین بۆ هەندێک گۆڕانکاری.

بۆ زۆربەی خەڵکی کێشەکە ئەوەیە کە "ئایا دەبێت شوێنەکەم لەناو ئەم هەمووەدا کوێ بێت؟" ئەوان دەربارەی پیشەی خۆیان و منداڵەکانیان دەشڵەژێن. ئەمانە پرسیاری سامناکن. هەندێک پیشە وندەبن بەڵام

ئەمانە هەمان پرسیارن گوێبیستیان بووم کاتێک کۆمپیوتەری کەسی گەیشتە شوێنی کار و پاشانیش هیچ شتێکی ترسناک ڕووی نەدا.

هەر کاتێک کارێک یان پیشەیەک نامێنێت، ئەو کرێکارەی کە ئەو کارەی دەکرد ئازاد دەبێت کە پیشەیەک یان کارێک نوێ بکات. ئەمە مانای وایە خەڵکی پیشەی زیاتر دەکەن و ئەمەش شتێکی باشە بۆ هەموویەکێک.

پێش ئەوەی ئێمە ئامێرمان هەبن، زۆربەی خەڵکی لە کێڵگە دەژیان و لەوێ کاریان دەکرد. ئەمڕۆ، کەمێکی خەڵکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەم پیشە وکارە دەکەن. منداڵە گەورە و بچووکەکانی جوتیارەکان نەوەستان لە کار و پیشە و ئەوان کاری نوێیان دۆزییەوە. لە ساڵی ١٩٩٠، زیاتر لە نیوەی ٥٠١ پیشەی جیاواز کە دەتتوانی ئەنجامیان بدەیت لە ساڵی ١٩٤٠ بونیان نەبوو.

کۆمپیوتەرەکان زۆربەی زۆری خەڵکیان ترساند _هەموو یەکێک تەنها منداڵانان نەبێت_ پێش ئەوەی ئەوان فێری بەکارهێنانیان ببن. کاتێک خەڵکی کاتێکی زیاتر لەگەڵ کۆمپیوتەرەکان بەسەر دەبەن ، ئەوان باشتر لە کۆمپیوتەرەکان دەگەن. تۆ دەتوانی بە کردنی گەمە کۆمپیوتەریەکان یان شتی تری سادە دەست پێبکەیت. کاتێک تۆ دەستت کرد بە بەکارهێنانیان باوەڕم وایە ئارەزوویان دەکەیت.



*١٩٦٨: بیڵ گەیتس لەسەر پێ وەستاوە و پاوڵ ئەڵێنیش لەسەر کۆمپیوتەرەکەی خوێندنگای لەیکساید کاردەکات. تۆ دەوانیت بە گەمە کۆمپیوتەرییەکان یان شتی تری سادە دەست پێ بکەیت.*

گرنگترین بەکارهێنەران منداڵان و گەنجانی ئەمڕۆدەبن . ئینتەرنێت بۆ داهاتوویە. بۆ ئەوەی ئەم داهاتووە بدەینە منداڵان، ئێمە پێویستە دوو شت بکەین، ئێمە پێویستە هەردووکیان کچان و کوڕان بێبنینە بەردەم کۆمپیوتەرەکان. ئافرەتانێک هەن لە بازرگانی کۆمپیوتەردا بەڵام شوێنی زیاتر هەیە بۆ زۆر ئافرەتی تر. هەروەها پێویستە ئێمە ئینتەرنێت بهێنینە ناو خوێندنگاکان بە پێدانی ئینتەرنێت بە نرخێکی کەمتری شیاو بۆ بەکارهینانی.

دەبێت لە داهاتوودا نرخی ئینتەرنێت چۆن بێت؟ خەڵکی دەربارەی ئەمە دەشڵەژێن لەبەرئەوەی ئینتەرنێت پێویستی بە ڕێژەیەکی زۆری بەکارهێنەر هەیە و هەروەکو چۆن ئەم ڕێژەیە هەڵدەگرێت جا بۆیە ئینتەرنێت گران نابێت.

هەروەها خەڵکی لە زۆر شێرکردنی زانیاری تاکەکەسی دەترسن. کۆمپیوتەرەکان پێشتر زانیاریان سەبارەت بە زۆرێک لە ئیمە هەیە _ ئەو ژمارە تەلەفۆنانی ئێمە بۆیان دەکەین، ئێمە لە خوێنکگا و کۆلێژ چۆن بووین، لە کوێ کاردەکەین و چەند پارە پەیدا دەکەین_ ئەمڕۆ، ئەم ڕاستیانە لە زۆربەی کۆمپیوتەرەکاندا هەن. هەر کۆمپیوتەرێک شتێک سەبارەت بە تۆ دەزانێت بەڵام هیچ کۆمپیوتەرێک هەموو شتێک نازانێت. بەڵام ئینتەرنێت ئەمە دەگۆڕیت چونکە کۆمپیوتەرەکان هەموویان دەتوانن لەگەڵ یەکتر گفتوگۆ بکەن. پێویستە ڕیسا و یاسای نوێ هەبن بۆ ئەم زانیارییانە؛ کێ دەتوانێت ببینێت و چۆن دەتوانن بەکاری بهێنن. ئیمە پێویست دەکات بە وریایی بریار لەسەر ئەو یاسایانە بدەین.

لە هەمان کاتدا، گرنگە کە بیرمان بێت کە کۆمپیوتەرەکان دەتوانن زانیاری بشارنەوە. تۆ دەتوانییت زانیاریەکانت بە بەکارهێنانی تیپەڕە وشەیەک یان ژمارەیەک بپارێزیت. ئەمرۆ کۆمپیوتەرەکان سیستەمی باشیان بۆ ئەمە هەیە. کۆمپیوتەرەکانی داهاتوو سیستەمی زۆر تەواوتر

وباشتریان دەبێت. بەبێ ئەم تێپەڕە وشەیە یان ژمارەیە، هیچ یەکێک ناتوانێت بزانێت و بخوێنێتەوە چی لەناو کۆمپیوتەرەکەت دا هەیە. لە ڕاستیدا زانیارییە تاکە کەسییەکانت پارێزراوتر دەبن لە چاو پێشان.

بەڵێ، کێشە بونیان دەبێت، بەڵام کێشە مەحاڵەکان نا. هەڵەش بونیان دەبن بەڵام ئێمە لێیانەوە فێردەبین.

پەنجا ساڵ لەمەوبەر، Antoine de Saint-Exupéry نوسەر و فڕۆکەوانی بەناوبانگی فەرەنسی، سەبارەت بە فڕۆکە وتەلەفۆن و فیلمەکان قسەی دەکرد کاتێک وتی باشترینی شتەکان کە خەڵکی دروستیان کردوون ئەو شتانەن کە خەڵکی بۆلای یەکتری دەهێنن و لەیەکیان نزیک دەکەنەوە.

ئینتەرنێت دەبێتە ڕیگەیەک بۆ زۆربەی شوێنەکان. من کاتێکی خۆشم هەبووە لە بیرکردنەوە سەبارەت بە هەندێک لەو ڕێگایانە و زۆر دڵخۆشم کە لەسەر ئەم ڕێگایەم.